

# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە.. ئەمیندارێتی رۆشنبیریو لاوان بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر
**حکمت حاجی سلیم**

جێگری سەرنووسەر
**حسین رەشوانی**

**٩١**

کانوونی یەکەم
١٩٩٠
ساڵی نۆیەم

لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس:
هەولێر: ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان
گۆڤاری کاروان: ت : ٢٠٨٨٢

لەنامەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکان لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ.
ئەو ووتارانەی نەشیان بۆ بلاوکردنەوە: نادرێنەوە بە نووسەرەکانیان.
لەچاپخانەی رۆشنبیریو لاوان لە هەولێر چاپکراوە

نرخی «٥٠٠» فلسە

# سکالای سەر گۆڕی شەهید

جەلال مەحمەت خۆشناو

هەولێر ١/١٢/١٩٨٩

کاکی شەهید...
زەمانێکە...
باس و خواسی ئازایەتیت
بوەتە چیرۆکی شەوچەرەی
گەلە کۆمەڵەی بەر ئاگردان!
ماوەیێکە...
ئەفسانەی پاڵەوانایەتیت
بوەتە سروود و باڵۆرەی
رێگە سەرکەوتنی هەموان!
دەورانێکە...
داستانی قارەمانایەتیت
بوەتە بەرتووك و لاپەرەی
مێژووی عیراقی نیشتمان!
کاکی شەهید...
راستە نازانم تۆی نەبەز
هی کام گوندی، هی کام شاری
بەڵام بە ئاوات و بەحەز
لە بیرەوەریمان دیاری
سێبەری وێنەی شەنگی تۆ
بوە بە بەڵگەو بەهۆ
لەناو دڵە، لەبەر چاوە
بوەتە پەیکەرێکی زێرین
بوەتە باڵایێکی دێرین
لەو شارەی دووبارە «فاو»ە!
کاکی شەهید...
کەتۆ خوێنی خۆت بەخت کرد
بۆ پاراستنی داك و خاك
کەتۆ گیانی خۆت سەخت کرد
لە پێناوی رۆڵەی دڵپاك
لە شەری ناڵەباری ستەم
دژی ئیستعمار..
لات وابوو مرۆڤ دەبێتن
خۆی بەخش کا بۆ سەرکەوتن
دەبێ پیاو، خوێنی بڕژێ

هەتاکو بە مەردی بمرێ
نەت دەزانی لەسات و کات
لەمانگی ئاب پاش هەشت تەمەن
جەژنێکی دیکە زیاد دەکەن
بۆ سەر بەرزی خاك و وولات
نەت دەزانی هەژدە ملیۆن
بۆ جەژنانەی تۆ تا مەز رۆن
لە پەرستگای پەیکەری تۆ
دەکەونە سەر دەست و ئەژنۆ!
کاکی شەهید...
لات وابوو کە خوێنت دەرژێ
بەسەر وولات دا دەپرژێ
سەرکەوتن بۆ عیراق دێنی
تەنها ئاواتێك دەروێنی
نەت دەزانی ئەو خوێنەی ئاڵ
لەیەکی کانون هەموو ساڵ
ملیۆنە ها سینگ و یاخە
بە نەخشی خوێنت پەرداخە
نەت دەزانی ئەم خوێنەی سوور
لە باکورا تاکو باشوور
ملیۆنەها گوڵ دەروێنێ
وەك گیانی تۆ...
بە سۆت و سۆ...
بەپوولەی شادی دەفرێنێ
لەعیراقی سەرۆك «صەددام»
سەرکەوتن دەخاتە ئەنجام!
کاکی شەهید...
چەندێ بیرەوەریت بکەم
بەحەیرانۆکی سەردوولکەم
کە مافی خۆتە لەسەر من
شیعرەکانم دێن و دەچن
لەرێگەی خەباتی هەوراز
نابن بەراز..!
پێنووسەکەم شەرمەزارە

بۆم نانووسێ چی لەبارە
نەدەتوانم....
ئەو ووشەیەت بۆ دەربرم
کە لایەقی شەنگی تۆ بێت
نەدەتوانم....
ئەو رستەیەت بۆ هەڵبرم
چەشنێ ئالای بەرگی تۆ بێت
وا دەروانم، هەر دەروانم
بەدوای ئەو هۆزان و شیعرەی
بیکەم بە میدالیای ئۆخەی
لەکێلی گۆرت هەڵکەنم
چلی زەیتوون، گوڵی گەنم
کە شەهید نەمرن، نامرن
لەهەموان شکۆمەند ترن!
کاکی شەهید....
داستانی تۆ پەرتوو کێکی
لەمێژوودا داهێناوە
سەرکەوتن و سەردەمێکی
لە عیراقدا راهێناوە
گیانی تۆ دەروا بۆ بەهەشت
بۆ سەیران و گەران و گەشت
من لەسەر زەوی نات گەمێ
خۆزگەم بۆ تاوێ بۆ دەمێ
بۆ لادانی ساتی خەمێ
هاورێی تۆ بامە بۆ جەمێ!
من دەزانم تۆ نەمردووی
لەدڵی هەموومان زیندووی
لەرێی هەبوون و لەرێی بوون
تۆ جەفەنگی سەردەمی نووی
چەند بسورێ چەرخی گەردوون
من دەزانم تۆ نەمردووی
«بل أحیاء...
عند ربهم یرزقون»

# نامەیەك بۆ سەلاحەددینی ئەیووبی

○ سعید یحیی ○

(١)
خەتامان کرد
سەلاحەددینی ئەیووبی
خەتامان کرد
ئەوەی «عەککا»ی لەدەست تۆدا
ئەوەی پێشەنگی دوژمن بوو
لەژێرەوە بەنهێنی
کلیلی شارەکەی بۆ برد
بەتیغی پیاوەتیو دادت
سەرت پەل داو لە ناوت برد
لەباتیی نەفرەت و شەرمە
شەهیدی نەمرە لای ئێمە
جەنابیشت گوناحت کرد
خەتامان کرد
رم و شمشێرو سەرنێزەو
عەبای بەرمان
رەوانەی هەندەرانمان کرد
ئەوەی ئەسپی بەزۆك و
خورت و وریایە
لەئالیکدا لغاومان کرد
لەمەیدانی قومارو رێسزو پارد
رەهامان کرد
جل و رەشمەی خوریی نەرم و
گوریسی زینی رەنگاو رەنگ
کەوان و تیرو پشت بێندو
تفاقی جەنگ
لەبازاری خەجاڵەتدا
مەزاتمان کرد
بە پوولی ئەو هەموو بەرگە
لەگەڵ دەستەی ژنی مەست و
خوماری شەو
لەمەلهاکانی ئەوروپا
سەمامان کرد

(٢)
خەتامان کرد
سەلاحەددینی سەرداری
موسڵمانان
پەنای ئاین و دەنگی هەق
فیدای ئیمان
خەتامان کرد
لەپاش سەرکەوتنی تۆوە
ئەوەی رێو رەسمی ئایینە
لەبیرمان کرد
وەکو تەیری «نەعامە»ی ترسنۆك
سەرمان لەناو زیخ ناو
پشتمان لە دوژمن کرد
نەشەومان شەو
نەخەومان خەو
نە کارو باری رۆژانە
هەموومان تێك و پێکدان و
حەیامان برد
لە شارێکەوە بۆ شارێ
لە بەندەرگەی وولاتاندا
لەبانانەوە بۆ خوارێ
لە بازارێکەوە بۆ کۆگاو
شەقام وبارو بازارێ
لەقاچاغ و شتی دزیاری
وەستا بووین
بەفەردەو باول و جانتا
زیانمان کرد
کتێب و دەفتەری مێژوو
وولاتی خوا
وولاتی خەڵکەکەی مردوو
وولاتی ئەم گەلەی زیندوو
وەکو کلاوێکی بابردوو
هەراجمان کرد
بەپارەی ئەو
جل و پۆشاکی ئەم چەرخەو
گوڵاوی خانمانەو
زێری جۆراو جۆر
سەعاتی دەست و خرخاڵ و
کەرەستەی ماکیاجمان برد

(٣)
خەتامان کرد
سەلاحەددینی ئەیووبی
خەتامان کرد
بەبیرو مێشکی کۆن و
هی هەزاران ساڵ
بەرەو ئەم چەرخی ئێستاکێ
پەنامان برد
بەکۆڵی پر لە کوێرە گرێو
نەخۆشیو خۆ بەکەم زانین
بەبیری داخراوی وون
بەرەو دوواوە خەباتمان کرد
سەلاحەددین بەقوربانە
گوناحمان تابڵێی زۆرە
بەچاو یەکسان و یەك تەبعین
بەناو ئازادو سەربەستین
بەپێکی پر لەسوز مەستین
کەچی بەدبەخت و گێژو ور
لەپر بەختی لەبارمان مرد
ئەوەی سوار چاك و ئازایە
ئەوەی بێترس و بێ باکە
لەبەر دوژمنی راناکا
بەدرۆی کەوتین،
زراومان برد

(٤)
سەلاحەددینی ئەیووبی
ئەوانەی کەوتیە فریا یان
لەداگیرکەر، پاست کردن
بەپەلە چوویتە هانایان
ئەسپەکانمان..
زموت کردن
شیرەکانمان لێ وەرگرتن
بەپارەو بیری شەیتانی
بەدەردی ناحەزیی بردن
بەشەرە جوێن
بەتفەنگ و تۆپ
بەنارنجۆك
شەری یەکترمان پێ کردن
لە دوژمنمان وەدوور خستن
خۆیان، ژنیان، کچیان، کوریان
دەربەدەرو ئاوارەی
دنیامان کردن

ژنمان کردنە
چێشت لێنەرو خزمەتگوزار
کچەکانیان..
لە کۆشکی پڕ نەوت و دۆلار
هی باش دەوڵەمەندانی شار
یالەو خانەی
بەنهێنی گرتوویانە
فێری دڵداریمان کردن
تا هەوەسی جەنابی میر
وەکو گاجووتی ملەستوور
هەردەم ئامادەبێ بۆنێر

(٥)

بەڵێ قوربان
سەلاحەددین
بەزینەری سوپای دوژمن
ئێستاکەیشی لەگەڵدابێ
فەرەنگەکان لێت دەترسن
عەبایەکە
لەبارانمان لێ دەباری
لەدریشتە دێنە خوارێ
لەخاکمان دەبیرێ گاسن
ڕەجاڵ و ڕووت قووت ماوین
لەبەر خاتری سوڵتانەکان
ئایەتی قورعانمان گۆڕین
بۆ چاوی شەیتانی لەعین
پێشەکیمان ڕەش کردەوە
لە حزوور گەورە پیاواندا
وەکو مەڕین
لەپێش کەوتین..
لەسەرکەوتین..
لەتخووبی ترسمان بڕین
هەرخەریکی کۆنەکاینەو
وەبای دەدەین
داستانی بووچەڵمان چنین
جارێک کورت و
جارێك درێژ
سەت جارانیش،
تێکی دەدەین
چوار خشتەکیو پێنج خشتەکی
لێ دەردەکەین
وەکو قوری دەسکردوایە
لەپەنجەکانی وەردەدەین
بەڵێ قوربان..
سەلاحەددین
ئێستاش چەرخی هەڵپەرکێیە
لە بانی پەتی خیانەتدا
زەمانی هەڵویستی مێیە
کوتینی دەهۆڵ و پیکە
لەسەر نەزمی قەباحەتدا
ڕۆژێکی پڕ لەجەفایە
هەرچی نامەردو دەعبایە،
چاو چڕنۆ و بەتەمایە..
ئەمرۆ پیاوی ئەمریکایە

(٦)

سەلاحەددین.. سەلاحەددین
قوربانی بازووی پۆڵایین
ئەوەی ئەمڕۆ لە ئارایە
لەگوناحمان گەورەترن
ئەوەی «ریتچارد»ی هێرش بەر
سوپای «مام سام»ی داگیرکەر
لەخاکماندان..
پڕن ، پڕن
لووتیان، چاویان، عەیب و عاریان
پۆستاڵی پیسی گڵاویان
وەکو تاوس
لەشەقام و بازاڕەکان..
خۆ بادەدەن
لەنزیك گۆڕی پێغەمبەر
نزیك یارانی پەیامبەر
هەرا دەکەن
وا مارینزی ئەمریکایی..
ئابڵۆقەی کابەیان داوە
ماڵی خولای بە قودرەتە
شوێنی ئاشتیو
عیبادەتە
شوێنی کۆتری بەسەزمانە
جێ ئاشیانەی
باڵندانە
هەرچی بەردە
لەحەوشەیان نەهێشتووە
ئیبلیسیان وا
پاڵ خستووە
نەبادا جاریکی دیکە
ڕەجم بکرێ
بەبەردی دەستی حاجیيان
ئازار بدرێ
تەماشاکە سەلاحەددین
تەماشای تەجاڵی مەلعوون
نێوقەد ئەستووری..
چاو زەبوون
چۆن ئافرەتی بۆ لوول دراوە
لەگەڵ دەستەی،
زمان لووس و کرێ گرتە
وا شەریتی سەوز دەبرێ
یەکەم بارو، یەکەم شوێنی
بیرەو ویسکی
کە ئەو نەختە هۆشەی ماوە..
لەبەر دەفرێ..
واکردیەوە
چێشتخانەیەك
گۆشت بەرازی لێ دەفرۆشرێ
دووای هەزارو چوارسەت ساڵان
بەدەستی ئەم شەرمەزارە
بیری دوواکەتن..
بردیەوە

(٧)

سەلاحەددین.. سەلاحەددین
پارێزەری، کۆڵەگەی دین
قارەمانی،
شەڕی «حطین»
ئەسپت زین کەو فریاکەوە
ئەوەی یەهوودا،
والێرەن
بەخۆیان و ڕیشیانەوە
ئاڵای شەش پەریان هێناوە
لە «خەیبەر»یان چەقاندەوە
ئەسپت زینکە، سەلاحەددین
ئەی نیشانەی ڕزگار کردن
مرواریی ئاڵای،
بەرزی دین
بەسەپێنە بەسەر خەڵکا
حوکمی یەزدان:
ئەوەی ناموسی بفرۆشێ
بەشیر دەمرێ
ئەوەی خاکی وڵاتەکەی
بۆ داگیرکەر والابکا
نەفرەت دەکرێ
ئەوەی زەلامی ئەوان بێ..
دووای مردنیش..
لەناو گۆڕدا
ئازار دەدرێ
پێشمان کەوە سەلاحەددین
بادەنگی هەق
زەویو ئاسمان بهەژێنێ
باخەنجەری تیژی دەستت
دوژمنەکان بترسێنێ
ئێمە..
چاوەڕوانی تۆینە
سمی ئەسپت
بەرەی ناهەق.. بتۆقێنێ

# فەرهەنگی قانوونی کوردی

دکتۆر: نووری تاڵەبانی

**ئەوەی راستی بێ ئەرکی پێشخستنی زمانی کوردیمان هەر لە ئەستۆی زمانەوان و شارەزایانی ئەم زمانە نییە، بەڵکو بەشێکی باشی ئەو ئەرکە دەکەوێتە سەرشانی رۆشنبیران، هەریەکەو لەچوار چێوەی شارەزایی‌و زانایی خۆیەوە.**

لە هەموو زمانێکدا، بەتایبەتی لەو زمانانەی وا سەدەها ساڵە بە هەموو جۆرێك خزمەت دەکرێن و پێش دەخرێن، دوو جۆرە فەرهەنگ هەن:

فەرهەنگێکی زمانەوانیی گشتی کە لەلایەن زمانەوانانەوە دانراوەو زوربەی زۆری وشەکانی ئەو زمانەی تێدا کۆکراوەتەوە؛ لەگەڵ فەرهەنگی، یاراستتر بڵێین

فەرهەنگۆکێك بۆ بەشێك لەو وشەو زاراوانەی وا پێوەندی‌یان بەزانیارییێکی تایبەتی‌یەوە هەیە.

هەڵبەتە ئامادەکردنی جۆری دووهەمی ئەم فەرهەنگانە دەکەوێتە سەرشانی پسپۆرو شارەزایان لەو جۆرە زانیارییانەوە.

لەم ساڵانەی دواییدا هەندێ لە مامۆستاو شارەزیانی کورد درێغیان نەکردووە لە ئامادە کردن و وبلاو کردنەوەی ئەو جۆرە وشەو زاراوانەی واپێوەندییان بە شارەزایی تایبەتی خۆیانەوە هەیە، جا چ بە هۆی‌گۆرینی هەندێ کتێبی قوتابخانەو هی‌تر بۆ زمانی کوردی، یاوەکو بەئامادە کردنی فەرهەنگێکی تایبەتی[1]، هەریەکەو بە پێی توانای خۆی.

ئەوەی پێویستە بیڵێم لەبارەی بیرکردنەوەمە لە ئامادەکردنی فەرهەنگێکی قانوونی‌ی کوردی ئەوەیە لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥دا بە ئەرکێکی زانیاری لە لەندەن بووم و ناوە ناوە چاوم بەزانای گەورەی کورد خوا لێی خۆشبێ مامۆستا «توفیق وەهبی» دەکەوت زۆر جار باسی زمان و فەرهەنگی کوریمان دەکرد، جارێکیان پێی گوتم بۆ خەریکی ووشەوزاراوەی «قانوونی»ی کوردی نابیت و، ئامادەیشی پیشاندا بۆ یارمەتیدانم لەم بارەیەوە. **قسەکانی ئەو زانا** گەورەیە هاندەرێکی باش بوو بۆ ئەوەی دەس بکەم بە کۆکردنەوەی وشەو زاراوەی قانوونی‌و هەوڵدان بۆ دانانی فەرهەنگێکی قانوونی بە کوردی.

بێگومان بە ئەنجام گەیاندنی کارێکی وا ماوەی دەوێ‌و ئاسانیش نی‌یە، ئەگەر ئەوە بخەینە پێش چاومان کەووشەی قانوونیی کوردی گونجاو لەگەڵ ئەو مانایانەی ئێستا لە کاروباری قانوونی‌دا بەکاردێن زۆرکەمن و بەکار نەهێنراون. هەروا تەرخان کردنیان بۆ ئەو مانایانە شتێکی ئاسان نی‌یە، بەلایەنی کەمەوە ماوەیەکی دەوێت تاوەکو خەڵکی، تەنانەت هەتا قانوون زانانیش، لەگەڵیاندا رابێن؛ چونکە پێشتر بەووشەی عەرەبی‌یەوە راهاتوون وهەموو رۆژێ بەکاری دێنن بۆیە دەڵێم

ئەم کارە دوێنێ بکرابایە چاکتربوو تاکو ئەمڕۆ، ئەگەر دەزگایێکی زانیاریو ئەکادیمی کوردی بەم کارە هەڵسابایە، نەك تەنیا لەبواری قانووندا، بەڵکو لە هەموو بوارە تایبەتی یەکانی تری زانستدا، ئەوە کارەکە باشتر دەبوو. بەلای منەوە وشەی کوردی بەگشتیو وشەی زانیاری بەتایبەتی، پێویستە لەلایەن یالەژێر چاودێری کردنی دەزگا زانیاریو ئەکادیمی یە کوردیەکانەوە ئامادەو بلاوبکرێنەوە، ئەگینا هەریەکە دەکەوێتە دانان و دارشتنی ئەو وشانە بەگوێرەی تواناو بۆچوونی خۆی.

ئەوەی راستی بێ لە ئامادەکردنی ئەم فەرهەنگەدا هەوڵی ئەوەم داوە وشەو زاراوەی قانوونی ی کوردی پەتی بدۆزمەوەو، پەنایشم بردۆتە بەر وەرگێران و دارشتن و دروست کردنی هەندی وشەی تر؛ بەڵام دەستکاری ی هەندێ وشەو زاراوەی ترم نەکردووە هەرچەندە لە بنچینەدا کوردی نین. هۆی بژار نەکردنی ئەم بەشە لە وشەو تێرمەنۆلۆژیانە ئەوەیە ئێستا بوون بەبەشێك لە زمانی کوردیمان و رۆژانە بەکاریان دێنین، بەشێوەی خۆیان یا بەگۆڕینێکی کەمەوە بەشێك لەم وشانە لە شەریعەتی ئیسلامەوە بۆمان ماونەتەوە، وەکو (شەرع، وەقف، تەلاق، نەفەقە، میرات، وەسیەت...) کە لەبەر ئەوەی لەمێژە لەزمانەکەماندا جێگیربوون، دەست تێوەردانیان کارێکی سووك و ئاسان نی یە. پاشان نابێ ئێمە ئەوەمان لەبیر بچێتەوە کە ئێمەی کورد لە میللەتانی موسلمانین، شەریعەتی ئیسلامیش میراتی هەموو ئەم میللەتانەن، خۆ بەشداری کردنی زانایانی ئایینی ی کورد لەکۆنەوە بۆ پێشخستنی ئەم شەریعەتەو زمانەکەی لەهی بەشی زۆری میللەتانی موسلمانی تر دیاری ترە.

هەتا بەنیسبەت ئەو وشانەیش واپێوەندییان بەشەریعەتی ئیسلامەوە نی یە، لەبەرئەوەی دەمێکە کەوتوونەتە سەرزارو رەگیان داکوتاوەو چەسپ بوون، گۆڕینیان جارێك جێی خۆی نی یە.

ئەوەی ئاشکرایە لای هەموو زمان زانێك ئەوەیە کە وشەی عەرەبی لەزمانی کوردی دا بێ بژار کردنیان گەلێك کەمترن لەو وشانەی وا کەوتوونەتە نێو زمانە دراوسێکانمان پاش پوخت کردنەوەیشیان، وەکو زمانی تورکی وفارسی.

لە هەڵبژاردنی هەندێ وشەی پێوەندی دار بەکاروباری بازرگانیو هەندێکی تر لەبواری سیاسی دا پەنام بردۆتە بەرهەندێ وشەو تێرمەنۆلۆژی لاتینیو فەرنسیو ئینگلیزی، چونکە لەزۆربەی زۆری زمانانی ئەمڕۆی ئەم جیهانەدا بەکاریان دێنین.

لەراستیدا بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانە لە زمانەکەماندا دەبێتە هۆی نزیك بوونەوەی لەو زمانانە کە لەبنەرەتدا بێ پێوەندی نین لەگەڵ زمانی کوردی دا، بەم جۆرە زمانەکەمان پێش دەکەوێت و دەوڵەمەندتر دەبێت بەووشەی تازەو نوێی وەکو: (دیموکراسی، سۆشیالیزم، بورجوازی، پۆلیس، ئینشورەنس، بالانس...) ئێستاش قسەیێکی زانایێکی سۆڤیەتیم لە بیرماوە کە بەسەردان لە ناوەراستی شەستەکان هاتبووە فەرەنساو باسی پەیوەندی ی زمانی فەرەنسی دەکرد لەگەڵ زمانی رووسیدا و دەیگووت: زمانی رووسی گەلێك سوودی لەووشەی سیاسی ی فەرەنسیەوە وەرگرتووەو ئێستاش بەکاریان دێنین وەکو ئەوەی بەشێك بن لە زمانی رووسی. ئەم چەند ووشانەیش وا لە کوردیدا بەکارمان هێناون گەلێك کەمترن لەووشەو زاراوە ئینگلیزی یانەی والە زمانی فەرەنسیدا هەن، وەیا لەو ووشە لاتینی یانەی لەزمانی ئینگلیزی دا ماونەتەوە. خۆ ئەگەر ئاورێك لە زمانە دراوسێکانمان بدەینەوە، زمانی عەرەبیشی لەگەڵدا بێت، دەبینین پرن لە ووشەی فەرەنسیو ئینگلیزی، بێ دەسکاری کردنیان یابەدەسکاری کردنێکی کەمەوە.

لەبەر ئەم رۆشنایی یە لەوەرگێڕاندا خۆم نەبەستووە بەزمانێکی تایبەتی یەوە؛ بەڵکو هەوڵی ئەوەم داوە بگەرێمەوە سەر بنچینەی ووشەکە. ئەوەی ئاشکرایە لای قانوون زانان ئەوەیە کە زۆربەی ووشەو زاراوە قانوونی یەکان لەزمانی فەرەنسیەوە لەلایەن قانوون زانە میسری یەکانەوە وەرگێڕاونەتە سەرزمانی عەرەبی. ئەم کارەیش دەمێکە دەستیان پێکردووە، هەر لەپاش داگیرکردنی میسرەوە لەلایەن ناپلیۆنی یەکەمەوە. جگە لەمەیش بنەرەتی زوربەی قانوونەکانی عیراق لە سەردەمی عوسمانی یەکانەوە تاکو ئەمرۆیش هەر دەگەرێتەوە سەر قانوونی فەرەنسی. جابۆ ئێمەش نەگەرێینەوە سەر بن و بنەوانی ووشەکەو لەسەرچاوەکەیەوە

ماناکەی وەرنەگرین؟ هەمان قسە راستە بەنیسبەت هەندێ وشەی‌تر کە لەزمانی ئینگلیزی یا لەزمانێکی ترەوەوەرگیراوە بۆ نموونە وشەی خودی «قانوون» خۆی وشەیێکی یۆنانیی کۆنەو لەو زمانەوە وەرگیراوە، کەچی لەبەر ئەوەی وا ئەزانرا پێویستە بەرامبەرێکی کوردی بۆ بدۆزرێتەوە، وشەی «یاسا» یان لە جیاتی بۆ بەکارهێنانی کە ئێستا خەریکە چەسپ بێت، کەچی بەمانای «نظام» دێت و، لەپایەدا لەقانوون نزمترە، چونکە ئەگەر قانوون لەلایەن پەرلەمانەوە، وەیا لە لایەن دەزگایێکی تری تواناو دەسەڵاتی پەرلەمانی پێ درابێت دابنرێت، ئەوە «یاسا» جاران لەلایەن کابینەی وەزیرانەوەو، ئێستا لەلایەن وەزیرەوە دادەنرێت، هەر لەبەر ئەم هۆیەشەوەیە ناشێت «یاسا» لەگەڵ «قانوون»دا ئەگونجێ یاوەکو هەڵی وەشێنێتەوە، بەپێچەوانە، قانوون دەتوانێ یاسا هەڵوەشێنێتەوە هەمان قسە راستە بەنیسبەت وشەی «پارێزەر» کە دەمێکە بەرامبەری وشەی «محامی» بەکارهێنانی چەسپ بووە بێ ئەوەی مانای خۆی ببەخشێ. ئەرکی سەرشانی ئەم قانوون زانانە هەر پارێزگاری کردنی ئەو «لایەنەی» دادخواز نی‌یە کەوا دەبن بەنوێنەریان؛ بەڵکو زیاتر هەوڵدانیانە بۆ روون کردنەوەی قانوون و یارمەتی دانی دادگایە بۆ دەرخستنی راستی تاکو مافدار بەمافی رەوای خۆی بگات و تاوانبار یا دەست درێژکەری سەرمافی یەکێکی‌تر بەجەزای خۆی بگات و رادەیەك بۆ دەست درێژی دابنرێت، بۆیە وشەی «دادیار»م پێشنیاز کردووە واتە دۆست و یارمەتی دەری داد. لیژنەی زاراوەی کوردی لە کۆڕی زانیاری عیراق «دەستەی کوردی» زاراوەی «دادیاری گشتی» بۆ «مدعی عام» داناوە، ئەم بۆچوونەی ئەوانیش راستە ئەگەر ئەوە بخەینە پێش چاومان کەلەزمانانی بێگانەدا زاراوەی «محامی الحق العام» بەکار دێنن لەجیاتی (المدعي العام)؛ کەواتە (دادیاری گشتی) پڕبەپێستی ئەم زاراوەیە.

لەبابەت هەڵبژاردنی وشەو تێر منەلۆژی فەرهەنگەکەوە تەنیا ئەوانەم هەڵبژاردوون واپەیوەندییان بەجۆرو بابەت و مەبەستی فەرهەنگەکەوە هەیە کە فەرهەنگێکی قانوونی‌یە.

جاروبار هەندێ وشەو زاراوەیش پێویستییان بەڕوونکردنەوە هەیە، بۆیە هەوڵی لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی ماناکانیم داوە بەچەند رستەو دەستەواژەیێکی رەشتەیی قانوونیی کورت.

فەرهەنگەکە وەکو پێشتر باسم کرد بەچوار زمانە: عەرەبی فەرەنسی، ئینگلیزی، ئەوجا کوردی. لێرەدا پێویستە وەڵامی پرسیارێك بدەینەوەکە دێتە بیری خوێندەواری بەرێز. ئەویش ئەگەر ئەم فەرهەنگە کوردی‌یە بۆچی بەزمانانی «عەرەبی، فەرەنسی، ئینگلیزی ئەوجا کوردی» دەست پێدەکات، نەك «کوردی، عەرەبی...؟»

بەشێك لەوەڵامی ئەم پرسیارەم لەسەرەوە دەست نیشان کردووە، بۆ زیاتر روونکردنەوەیشی دەڵێم بەشی زۆری وشە کوردی‌یەکان پێشتر بەکار نەهێنراون بە مانا تایبەتی‌یە قانوونی‌یەکانیان، خوێندەواران، تەنانەت شارەزایانی قانوونیش وشە عەرەبی‌یەکان دەزانن: بەڵام جاری شارەزاییکی ئەوتۆیان لە بەرامبەرەکەی بەزمانی کوردی پەیدا نەکردووە. مەبەستی سەرەکیی دانانی وشەوزاراوەی قانوونیی کوردی ئەوەیە ئەگەر رۆژێك زمانی کوردی بەکارهێنرا لە دادگاکانی کوردستاندا قانوون زانان دانەمێنن بۆ بەکارهێنانی وشەو زاراوەی کوردی قانوونی. لەگەڵ مانای وشەکە بەعەرەبی، بەفەرەنسیو ئینگلیزیش ماناکەیمان بۆ داناوە لەبەر دووهۆ:

یەکەم: بۆ شارەزاتر بوون لەو دوو زمانە لەبارەی زمانی قانوونی‌یەوە.

دووهەمیان: بۆ دەرخستنی مانا راستی‌یەکەی ئەو وشانە، چونکە وەکو لەسەرەوە باسمکرد، ئەم ویستووە خۆم ببەستم بەمانای عەرەبی وشەکەوە، بەڵکو بگەڕێمەوە سەر بنەڕەتەکەی.

ئەم فەرهەنگە قانوونی‌یە گەر خوا یاربێت بتوانم چاپی‌بکەم، یەکەمین تاقیکردنەوەیە لەزمانی کوردی‌دا، بۆیە بێ کەم و کوڕی نابێت؛ بەڵام سەرەتای ئەنجام دانی کارێکی زانیاری‌یەکە دەمێکە دەستم پێ کردووە؛ بەڵام لەبەرئەوەی هەنگاوی یەکەمینە لەم بارەیەوە، پێویستم بە هاوکاریو یارمەتی‌دانی هەموو شارەزایانی زمانەکەمان و قانوون زانانی کورد هەیە تاوەکو باشتر جێی خۆی بکاتەوە لەناو کتێبخانەی کوردی‌دا.


طاهرێ شوّشی


ئەحمەدێ خانی

# کێش د ناڤبەرا مەم وزین و گولزارێ دا

تحسین ابراهیم دۆسکی

ئەحمەدێ خانی (١٠٦١ ـ ١١١٩ مشەختی) ئو طاهرێ شوشی (١٣٣٦ ـ ١٣٨١ مشەختی) دو ناڤێت گەش و ئاشکەرا نە دلیستێ هوزانڤانێت مە یێت کلاسی دا.. جا پێ نەڤێت بەحسێ زیرەکی و شارەزاهیا هەر دووا دوبارەبکەین ل ڤێرە. بێ گومان هەردو زێدە دمەلەڤان بون د زانینا عەروزێ داو ئەڤ ئێکە یا خویا یە بو هەر ئێکێ ب شینوار و پاشماییێت وان ئاگەهدار.

د ڤێ کورتە پەیڤێ دا ـ برایێ خواندەڤا ـ مە پێ خوشە هندەکێ ل سەر کێشێ د هوزانێ دا باخڤین نەمازە کێشا دو مرارییێت ئەدەبێ کوردی ـ مەم و زین ئو گولزار ـ کو دبنیاتێ دا ئێکن...

★ کێش د هوزانێ دا:

یا زانایە کو هوزان دبنیاتێ دا یا هاتیە ڤەهاندن دا ببیتە ستران و بکەڤتە سەر ئەزمانا، ژبەر ڤێ چەندێ ئیقاع و موسیقە ژ پێتڤییێت هوزانێ بون دا کو یا سڤك و شرین بت ئو زوی بێتە ژبەرکرن.

پەیڤ ـ د ستران و نەسترانێ دا ـ یا پێك هاتیە ژ چەند کەرا ـ برگا ـ و ئەڤ کەرە یان دێ د کورت بن یان د درێژ، ئەگەر هات وکەر هەمی دکورت بون ئەودەنگێ د ئێتە کرن ژزارڤەکرنا وان دێ یێ گران و نەخوش بت، هەر وسا گەر هەمی د درێژ بن. لێ ئەگەر هات و مە کەرێت جودا و نە وەك ئێك ب رەنگەکێ تایبەت و ب سەرو بەر ئێخستنە بەر ئێك ئەودەنگێ ژێ را دبیت دێ ئاوازەکێ خوش و سڤك بیت... ل سەر ڤێ بناغەی زانینا کێشێ ـ عەروزێ ـ سەر هلدا و کێشێت خوش و رەهوان بو هوزانێ هاتنە دانان و دەست نیشان کرن، نە بتنێ د هوزانا عەرەبی دا بەلکی خو د هوزانا یونانی یا کەڤن ژی دا..

پتر روهنکرن بو ڤێ مەسەلێ دێ بێژین:

کەرێ کورت: ئەو برگەیە یێ ژ پیتەکا لڤیای- حرف متحرک - بتنێ پێك هاتبیت، وەکی پیتا (ذ) ژ پەیڤا (أزم) ئو ئەڤ رەمزە (ل) بۆ تێتە دانان.

کەرێ درێژ: ئەو برگەیە یێ ژ پیتەکێ پتر پێك هاتبت وەکی (زم) ژ پەیڤا بوری (أزم) ئو ئەڤ نیشانە (-) بۆ تێتە دانان.

ل دویڤ رێچا فەراهیدی:

١- ئەگەر دو کەرێت کورت کەتنە بەر ئێك وەکی: (ور) هنگی دێ بێژنێ: سەبەبێ گران.

٢- ئەگەر کەرەکێ درێژ بتنێ هات دێ بێژنێ: سەبەبێ سڤك. وەکی (بر).

٣- ئەگەر کەرەکێ کورت بەری ئێکێ درێژ هات وەکی: (أزم) دێ بێژنێ: وەتیدێ لێکدای - وتد مجموع -.

٤- ئەگەر کەرەکێ درێژ بەری ئێکێ کورت هات وەکی: (مار) دێ بێژنێ: وتیدێ بژیای - وتد مفروق -.[1]

ئەڤە ل نك فەراهیدی، دکێشێت یونانی دا: ئەگەر کەرەکێ کورت بەری یێ درێژ هات دبێژنێ ئایامب، ئەگەر کەرەکێ درێژ بەری یێ کورت هات دبێژنێ تروشی، ئەگەر کەرەکێ درێژ بەری دو یێت کورت هات دبێژنێ داکتیل، ئەگەر دو کەرێت کورت بەری ئێکی درێژ هاتن دبێژنێ ئەنابست.[2]

پشتی ئەم کەرێت بوری ب رەنگەکێ تایبەت دئێخینە بەر ئێك دێ بۆ مە چەند دەنگەك دروست بن - وحدات صوتیة - فەراهیدی دبێژتێ (تەفعیلە) و یونانییا دگوتێ (گاف) ئو ژ ڤان دەنگا کێشێت هوزانێ چێدبن نەبتنێ هەر شازدێت عەروزی بەلکی هندی هوزانڤانی دڤێت.[3]

پێ نەڤێت بێژین و بێژینەڤە کێش ئیقاع و موسیقەیە ئو موسیقە نە یا روژ هەلات و روژئاڤایی یە و نە ملکێ چ مللەتێت تایبەتە، بەلکی دێ هنگی ب مللەتەکی ڤە ئێتە گرێدان دەمێ ئاوازەکێ وی مللەتی پێ بێتە لێدان. بو نمونە: تەمبویر ئامویرەتەکێ موسیقی یە ژ چەند تێلەکا یێ پێك هاتی یە، ئەڤ تێلە نە د کوردی نە و نە د عەرەبی. لێدەر دشێت ئاوازەکێ کوردی - یان عەرەبی یان خو ئنگلیزی - ژێ بدەرینت.. وەکی تەمبویرێ کێشێت هوزانێ ژی ب هژمێرە چونکی ئەو ژی هەر موسیقەنە.[4]

★ کێشا (مەم وزین) ێ:

نەدیارکرنا خانی بۆ کێشا مەم و زینا خورێ ل بەر سنگێ خویانی و بیانیا ڤەکر دا گوت - گوتکا سەبارەت ڤێ چەندێ بکەن، ئەگەر چ راستیەك بۆ گوتنێت وان هەبت ژی یان نە! ب هەمی رنگا یێت هاتینێ و خو ماندی کری بەس دا نێزیکی دەریایەکێ ژ هەر شازدا بکەن چونکی خانی - ل دویڤ هزرا وان - نە ئەو بوو یێ ژ دەریاییێت فەراهیدی بدەر کەڤێت، لەورا پشتی زەحمەتەکا زێدە دیتی ئو ب هاریکاریا روژهەلاتناس (براون)ی گەهشتنە هندێ کو کێشا مەم و زینێ ژ دەریا هەزجە و ب ڤی رەنگی تێتە دەست نیشان کرن (مفعول مفاعلن فعولن)...

ل سەری بلا بزانین فەراهیدی یێ دەست هەل قەت چ دەریایەك چێ نەکرینە بەلکی دورێ وی بتنێ دەست نیشانکرنا وان کێشا بوو یێت هوزانڤانێت بەری وی دروست کرین. لەورا ئەو کەسێ هزر بکەت دەرکەفتنا هوزانڤانی ژ ڤان دەریا بۆ هندەك کێشێت دی بێت رێك وپێك خەلەتە زیانەکا مەزن دگەهینتە هوزانێ و دجهـ دا د قەرسینت. **گەلو هوزانڤانێت عەبباسی و ئەندەلوسی چەند کێشێت نوی دروست کرن و هەرمان قەردارێت فەراهیدی؟ بێ گومان گەلەك!**

**بەری چەند سالەکا سەیدایێ هێژا تێلی ئەمین دو** گوتارێت بەرکەتی ل دور **کێشا مەم و زینێ نڤیسیون ئێك** ب کوردی دگوڤارا روشنبیری نوێ دا ژ ١٠٩ **سالا ١٩٨٦، ئو ئێك** ب عەرەبی دگوڤارا الادیب الکردی دا ژ ٢ سالا ١٩٨٦.

پشتی ل دویڤ چونەکا درێژ و موخل و بێژنگ کرنەکا موکم سەیدا گەهشتە هندێ کو مەم و زین ل سەرکێشا دەهـ برگەیی یا هاتیە راچاندن و دبێژیت:

چ مالك دەمەم و زینا دا نینن برگێت وێ پتر بن ژ دەهـ پەنجا ئەلبەتە بو تەحقیق کرنا ڤێ چەندێ گەلەك گرنگە مالك بدروستی بێتە خواندن[5].

تشتێ بەر چاڤ سەیدایێ نڤیسەر ب هەمی هێزا خوێ هاتیێ کو (ئێکجار) پەیوەندی یێ دناڤبەرا مەم وزینێ و عەروزییەتێ دا ببرت..

هەرچەندە ئەمێ ل گەل سەیدای د بۆچوونا وی یا پێشی یێ دا کو مەم و زین ل سەر دەهـ برگەیێ یە، لێ وە نەبیت بێژین

خانی بەندکێ د ناڤبەرا خو و رێچا فەراهیدی دا قەتاندی و چ سود ژ رێبازا وی نە وەرگرتینە.. نە خێر، یا ئاشکەرایە ناڤبری مفایێ ژ زانینا عەروزێ وەرگرتی و مەسەلە نەبتنێ فلکلورە هەر وەکی دێ بومە ل باشیێ خویا بیت.

★ کێش د گولزارێ دا

بو زێدە پشت راست بوون کو کێشا مەم و زینێ کێشەکا تایبەتە و نەژ دەریا هەزەجە دێ ل ڤێرێ بەلگەیەکێ دی یێ ب هێز و گومانبڕ دانینە بەر چاڤ دا بێتە زێدەکرن ل سەر وان بەلگەیێت سەیدا تێلی ئەمینی دەست نیشان کرین، ئەڤ بەلگە کێشا گولزارا خودێ ژێ رازی شێخ طاهرێ شوشی یە.

هەر کەسەکێ مەم و زین و گولزار خاندبن دێ زانت شوشی گەلەکێ داخبار بوویە ب خانی و دیسا کارتێکرنا بەرچاڤ یا مەم و زینێ د گولزارێ دا دێ بو وی دیار بیت.. نەبتنێ د سەرو سیما دا بەلکی خو د کێشێ ژی دا.

خانی ب ڤان مالکا دەست پێ دکەت:

سەر نامەئێ نامێ نامێ ئللاهـ
بێ نامێ وی نا تەمامە وللاهـ
ئەی مەطلەعێ حوسنێ عشقەبازی
مەحبوبێ حەقیقی یو مەجازی
نامێ تە یە لەوحێ نامەیا عشق
ئسمێ تەیە نەقشێ خامەیا عشق...

نو دەسپێکا شوشی ب ڤی رەنگی یە:

الله کو چ ناڤەکێ شرینە
گوتنا وی حەیاتێ جان و ژینە
ئەی ناڤێ تە یە رەحیم و رەحمان
وەی ذکرێ تە یە شیفا ئو دەرمان
هەر حەمد و سەنا ئو شوکر و مننەت
هەر بو تە خودێ خودانێ رەحمەت..

ئەگەر بێت و لسەر کەرێت کورت و درێژ ئو ل دویڤ دەست و دارێت مە بەری نوکە دیارکرین مالکێت مەم و زینێ و گولزارێ لێکڤە بکەین دێ ب ڤی رەنگێ خارێ بو مە دیاربن:

١ـسَرْنا مَـ ئرِ نُا مـ نا مـ ال لاهـ
ـ ـ ل ل ـ ل ـ ل ـ ـ
درێژ درێژ کورت کورت درێژ کورت درێژ کورت درێژ درێژ

بی نا مـ و نا تـ ما مـ ول لاهـ
ـ ـ ل ل ـ ل ـ ل ـ ـ
درێژ درێژ کورت کورت درێژ کورت درێژ کورت درێژ درێژ

٢ـهر حمـ د س نا و شك ر منـ نت
ـ ـ ل ل ـ ل ـ ل ـ ـ .
درێژ درێژ کورت کورت درێژ کورت درێژ کورت درێژ درێژ

هر بو تـ خـ دی خـ دا ن رحـ مت
ـ ـ ل ل ـ ل ـ ل ـ ـ
درێژ درێژ کورت کورت درێژ کورت درێژ کورت درێژ درێژ

ژ ڤێ چەندێ بو مە دیار بو کو کێشێت هەردو هوزاننامێت ناڤبری ئێکن و قەت چو جوداهی دناڤبەرا هەر دوان دا نینە.

ژ باشێیت خودێ ژێ رازی شێخ طاهرێ شوشی کرین ئەوە رێ ل بەر سنگێ گوت گوتکا نەهێلایە ڤەکری دەربارەی کێشا هوزاننامَا خو بەلکی ناڤبرەکا ـ فصل ـ تایبەت یا دانای ل بن ناڤ و نیشانێت (تاریخ الابتداء بنظم الکتاب ومیزان نظمه)[1] تێدا دبێژت:

گاڤا مە سەرێ کیتابێ دانی
ماهێ رەمەزان بو خوش ل جانی
حەفتێ و شەش و هزار سێ سەد
بو هیجرەتێ یارێ مەی محەممەد

ئانەکو ل رەمەزانا سالا ١٣٧٦ ێ مشەختی (بەرامبەر ١٩٥٦ز) دەست ب ڤەهاندنا گولزارا خو کریە.

وەزنا وێ ب لەذذەت و شرینە
ناڤ علمێ عەروزێ ناڤ چو نینە

ب چەلەنگی شیا بێژتە مە: ئەڤ کێشا مەکریە بناغە بو گولزارێ د علمێ عەروزێ دا یا بێ ناڤـە، چونکی نە ژوان دمریایانە یێد فەراهیدی دەست نیشان کرین و ناڤ لێ دا نایِن. شوشی نە گوت: ئەڤ کێشە تشتەکە و عەروز تشتەکێ دی یە! نەخێر، چونکی هەر ئەڤ کێشـە ژی یا گرێدا یە ب رێباز و بنەسترێ علمێ عەروزێ ڤە وەك ئەو بخو دێ دمالکێت بێن دا دیار کەت.

لەورا ب خصـوصی هەر زمـانـەك
هەر شعـرەکـێ بو هەیـین نیشـانـەك

هەر ملـلەتـەکێ هەبت خەسلەتەکا تایبەت یاهەی کو ب هندەك ئاوازا پتر هاویش دبت لەو دێ بینی هوزانڤان وسترانبێژ و مەزنێت وان پتر ل دور ڤان ئاوازا دزڤرن، حەتا ل دویماهیێ هزر بو هندێ دچت کو ئەڤ ئاوازە ژ تایبەتیێت ڤی مللەتی‌نە، لێ د بنیاتێ دا وە نینە چونکی کێش موسیقەیە و موسیقە ملکێ هەمی مللەتا یە وەکی بەری نوکە مە گوتی.

ئەی دۆسـتـۆ ئەگـەر تە ئارەزویـە
نەظمـا ڤێ شریـن کتـێـبـێ کویـە
وەزنـەك ژ وێـرا مەگـوت ب دلـخـواز
هەم رێـك و رەوانـە نەظم و ئاواز
[فـعـلن ـ فعـلن ـ فعـل ـ فعـولن](٧)
ئەڤ چوارە ریـاضێ نور ئوصـولن

ئەڤە یە پەیوەندیا دەهـ برگەیێ دگەل عەروزێ کو بناغێ وێ مروڤ دشێت بزڤرینتە سەر چار تەفعیلا، جا بلا هوزانڤان یێ ئاگەهدار بیت و بزانیت نە هەر گاڤاکا دەهـ برگە گەهاندنە ئێك دێ ئیقاعا ڤێ کێشێ ژێ دروست بت.

ئەڤەو یا ژ هەژی گوتنێ یە بێژین هوزانڤانێ دەست هەل و شارەزا پەرتو بەگێ هەکاری هوزانەکا سەد و بیست و دوو مالکی ل سەر ڤێ کێشێ یا ڤەهاندی و کارتێکرنا مەم و زینێ دڤێ هوزانێ دا گەلەکا ئاشکەرایە.

ل سەری دبێژت:

سەر نامـەتـێ فەتـحێ ئێن موناجـات
چێـکـر مە ژ بو قەزایـێ حاجـات
دیـبـاجـە ب ناڤـێ ئسـمـێ ئللاهـ
دانـی مە ژبـو رجـائـێ دل خواهـ
بێ قودرەتـێ وی نهـن ئیرادە
بێ روخـصـەتـێ وی نهـن ئیـفـادە

ئو ل دیماهیێ دبێژت:

یارەب مە ژ لەوت و جورم و زەحمـەت
یەکسـەر تو ب شو ب ئاڤـا رەحمـەت
یا رەب گونـەهـان مەگـر ل پەر تو
رەحـمـا خو ل حالێ وی کە پەرتـو(٨)

★ دەهـ برگەیی و عەروز:

بەری نوکە مە گوت خانی دکێشا مەم و زینێ دا دیسا شوشی د گولزارێ دا ژ بنـەسـترێت زانینا عەروزێ دویر نە کەتینـە و پەیوەندی دناڤبەرا خو و وێ دا نەبریە، ب بەلگەیە زڤـرانـدنـا بنـاغێ کێشێ بو چار تەفعیلا ئو ب کارئینانا وان گهـورینێت دبێـژنێ (زحـاف) ل دویڤ وان بناغێت د زانینا عەروزێ دا هاتینە دەست نیشانکرن.

یا زانایە گهورینا (زحاف) دکەڤتە کەرێ درێژ (-) و نا کەڤتە کەرێ کورت (ب) ب چ حالێ هەبیت، یان بزمانێ عەروزیا دکەڤتە د سەبەبی دا چ یێ گران بیت یان یێ سڤك ئو قەت ناکـەڤـتـە وەتیـدی ب چ رەنگێ هەبیت، ئەڤ کهـورینـە دەستـویـریـی‌یـەکـە یا هاتیـە دان بۆ هوزانڤـانی دا پتر یێ سەربەست بیت د هلبژارتنا پەیڤان دا نەخاسمە چ کەر ب ڤێ چەندێ ژ کێشێ کێم نابن.

ئەگەر بێت و سەحکەینە مالکێت مەم و زینێ و گولزارێ دێ بینـین گهـورین هەمی یێت کەتینە د کەرێت درێژ دا (د سەبەبا دا) ئو گەلەك کێمە تو جارەکێ ببینی کەرێ کورت یێ درێژ بوی، ئەگەر کت و ماتەك هەبن ژی پێ لێدانا بنەسترایە و چ ددی نە!

نوکـە ل خارێ دێ چەند گهورینێت (زحافێت) کەتینە مالکێت مەم و زینێ گولزارێ دا دیار کەین.

۱ـ خانی دبێژیت:

**سبحانك كلما خلقت     احسنت فكيف ما فلقت**

**ئەگەر بێت و ب رێبازا عەروزی ڤێ مالکێ کەرکەین دێ بلی ڕەنگێ ژوری بت:**

سبـ حا نـ ك كل ل ما خـ لقـ ت

- - ل ل ل- - ل - ل

فعلن فعلن فعل فعول

احـ سنـ ت فـ كيـ ف ما فـ لقـ ت

- - ل ل ل- - ل ل-

فعلن فعلن فعل فعول

ئاشکەرایە زیحافا (قەبض) یا کەتیە د (عەروز)و (ضرْبا) ڤێ مالکێ دا، چونکی (فعولن) یا بوویە (فعول).

۲ـ دیسا دبێژیت:

شیـ رین تـ کـ ر شـ کر ل بر ویز

- - ل ل ل / ل - ل - -

فعلن فعل فعل فعولن

فر ها د ژ رن گ اشـ ك خون ریز

- - ل ل ل- - ل - -

فعلن فعلن فعل فعولن

زیحافا (طەی) یا کەتیە د (حەشوا) نیڤا ئێکی دا ژ مالکێ، فعلن یا بویە فعل.

۱ـ شوشی دبێژت:

هر و ب و حمـ مـ دی مـ با ور

- ل ل ل- - ل - -

فعل فعلن فعل فعولن

عبـ دی تـ یـ قا ص دی پـ یمـ بر

- - ل ل- - ل - -

فعلن فعلن فعل فعولن

زیحافا (طەی) یا کەتیە د تەفعیلا ئێکێ دا ژ مالکێ.

۲ـ دیسا دبێژت:

طا هر تـ یـ ك ژ جمـ ل یا ران

- - ل ل ل ل - ل - -

فعلن فعل فعل فعولن

قر با نـ تـ یـ هـ رو د جا ران

- - ل ل ل ل - ل - -

فعلن فعل فعل فعولن

زیحافا (قەبض) یا کەتیە د تەفعیلا دووێ دا ژ نیڤا ئێکێ و دووێ ژ مالکێ.

دەهمەن:

۱ـ د رێ نڤیسا عەروزی دا سەرنە ـ فتحة ـ بەر نو ـ ضمة ـ جرنی ـ کسرة ـ نا ئێنە هژمارتن پیتێت سەربخو، دیسا هەرپیتەکا د زارکرنێ دا سڤك ببیت. ئەڤە و دڤێت ژبیر نەکەین کو رێ نڤیسا کوردی حەتا سەرێ ڤی چەرخی ژی لڤ ـ حرکة ـ نە د هژمارت پیتەکا سەربخو!

۲ـ عمر فروخ: هذا الشعر الحديث چاپا ئێکێ بپ ٦٦ ـ ٦٧.

۳ـ روژهەلاتناس (مارتن هارتمان) پشتی ڤەکولینەك ل سەر مووەششەحاتا کری گوت: کێشێت وان دگەهنە سەد و چل و شەشتا ئو مروڤ دشێت هندەك کێشێت دی ژێ چێکەت کو هژمارا وان بگەهتە دو سەد و سیهـ و سێ یا. (ژێدەرێ بەرێ بپ ٦٤).

٤ـ ژێدەرێ بەرێ بپ ٦٤و ٧٠

٥ـ گوڤارا روشنبیری نوێ ژ ١٠٩ بپ ١٦١، کێش د مەم و زینێ دا.

٦ـ گولزار بپ ٨٦.

٧ـ دبیت هندەك جارا مروڤ بشێت دو ڕەنگە تەفعیلا ـ یان پتر ـ بو ئێك کێش دانیت د علمێ عەروزێ دا ئەڤ چەندە یا ئاشکەرا یە بو هەر کەسێ ب ڤی علمی ئاگەهدار، ئەڤ کێشە ژی وان کێشایە. ژبلی چار تەفعیلێت شوشی ئەم دشێین ڤان هەر سێ تەفعیلا بو بکەینە قالب (فعلن، متفاعلن، فعولن) یان ڤا هەردوا (مستفتعلن ، مفاعلاتن).

٨ـ دیوانا پەرتویێ هەکاری بپ ٤٥ ـ ٥٦

# «مۆرفیم»

نووسینی: عبدالخالق احمد عزیز

بەر لە سەرهەڵدانی زانستی مۆرفۆلۆژی ووشە بەو شێوەیە پێناسەدەکرا کە بچوکترین یەکەیی بنچینەیی مانادار ی زمانە. بەڵام دوایی سەرهەڵدانی زانستی مۆرفۆلۆژی ئەم پێناسەی سەرەدود بە پەسند نەزانرا، چونکە هەندێ ووشە هەن لە چەند دانەیەکی بچوکی مانادار پێکهاتون، ئەم دانە بچوکانەش بریتین لە یەکەیی زمانەوانی و مانای تایبەتی خۆیانیان هەیە پێیان دەووترێ (مۆرفیم). مۆرفیم لە ووشەی morphe یونانی‌یەوە وەرگیراوە و مانای پێکهێنەر یا شێوە دەکەیێنێ.

پێناسەی مۆرفیم:-

زۆربەی زۆری ئەو پێناسانەی بۆ مۆرفیم کراون لەچەند خاڵێ یەکتر دەگرنەوە:-

١ - بچوکترین یەکەی مانادار ی زمانەوانی‌یە، مانای تایبەتی هەیە.

٢- ناتوانرێ بۆ پارچەی لە خۆی بچوکتر شێ بکرێتەوە و بە مانادار ی بمێنێتەوە.

٣ - لە قەبارە جیاوازن. ژمارەی برگەیی جیاوازیان هەیە.

مامۆستا د. ناوردحمانی حاجی مارف بەم شێوەیە پێناسەی دەکا: «بچوکترین دانەی واتادار ی زمانە.»[1]

ڤکتۆر فرۆمکلن و رۆبەرت رودمان بەم شێوەیە پێناسەی دەکەن:- «دەکرێ مۆرفیم بەوە پێناسە بکرێ کە بچوکترین یەکەی زمانەوانی‌یەو یەکەیەکی رێزمانی‌یەو یەکیەتی‌یەکی پتەو لە نێوان دەنگ و ماناکەی دا هەیە، کە ناتوانرێ بۆ پارچەی لە خۆی بچوکتر شێ بکرێتەوە.»[2]

مەبەست لە پارچەی بچوکتر ئەوەیە کە ناتوانرێ مۆرفیم دابەشی پارچەی لەخۆی بچوکتر بکرێ و ئەم پارچە بچوکانەش هەر بە مانادار ی بمێنێتەوە.

مۆرفیم دەکرێ بە دوو جۆری سەرەکی‌یەوە:-

١ - مۆرفیمی سەربەست Free Morpheme

٢ - مورفیمی بەستراو Bound Morpheme

١ - مۆرفیمی سەربەست

ئەم جۆرە مۆرفیمە بە تەنیایی لە رستەدا هەڵدەکەوێ و مانای تایبەتی خۆی هەیەو رێزمانی‌یە. وشەی سادە لەم جۆرە مۆرفیمەن و. لە قەبارەدا جیاوازن. واتە لە ژمارەی برگەدا لە یەکتری جیان. وەکو لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:-

ا - مۆرفیمی سەربەستی یەك برگە - کەو، ژن. شەو.

ب - مۆرفیمی سەربەستی دوو برگە:- کۆتر. خانوو. ماستاو

جـ - مۆرفیمی سەربەستی سێ برگە:- ئەستێرە، پەنجەرە.

٢ - مۆرفیمی بەستراو (بەندکراو):-

ئەم جۆرە مۆرفیمە بە تەنیایی لە رستەدا هەڵناکەوێ چونکە بە تەنیا بێ مانایە تەنیا لەگەڵ مۆرفیمی سەربەست دا دەبێ هەر بۆیەش پێی دەووترێ بەستراو، ئەم مۆرفیمە دەکرێ بە چەند بەشێ، وە بە زۆری کارەکەی دارێژەرە واتە وشەی تازەی پێ دروست دەکرێ، وە مەرج نی‌یە رێزمانیش بێ، چونکە هەندێ جار دەچێتە سەر مۆرفیمی سەربەست ماناکەی ناگۆرێ.

لەم جۆرە مۆرفیمەش:-

ا - پێشگر (پێشبەند) Prefix

لە ناوەکەی دەردەکەوێ کە ئەم مۆرفیمە دەکەوێتە سەرەتایی ووشەوە (مورفیمی سەربەست) ژمارەی پێشگر لە زمانی کوردی‌دا گەلێ زۆرە.

لەم چەند نموونەی خوارەوە پێناسەی مورفیمەمان بە تەواوی بۆ بە دیار دەکەوێ، کە دانەی بچووکی مانادار ی رێزمانین و دارێژەرن.

| ووشە | پێشگری | | | |
|---|---|---|---|---|
| مورفیمی سەربەست دا | | را | هەڵ | تێ |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |

| خستن | داخستن | راخستن | هەڵخستن | تێخستن |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| کردن | داکردن | راکردن | هەلکردن | تێکردن |
| ماڵین | داماڵین | راماڵین | هەلماڵین | |
| گرتن | داگرتن | راگرتن | هەلگرتن | تێگرتن |
| چوو | داچوو | راچوو | هەلچوو | تێچوو |

ئەگەر سەرنجی لە وشەکانی ستوونی (١) بدەین، دەبینین وشەکانی ئەم ستوونە مانای تایبەتی خۆیانیان هەیە، بەلاّم پاش ئەوەی پێشگری (دا، را، هەل، تێ)مان خستنەسەر، کە بە تەنیا بێ‌مانان، مانای جیاوازیان دروست کرد، کە هەر وشەیێ لە ستوونی (٢، ٣، ٤، ٥،) جیاوازە، وە (٢ لەگەڵ ٣، ٣ لەگەڵ ٤، ٤ لەگەڵ ٥)یش لە مانا لە یەکتر جیاوازن.

ئەمەش لە ئەنجامی زیاد کردنی ئەم مۆرفیمانە، واتە پێشگرانە، بوو لە بەرایی وشەکەوە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم پێشگرانە مورفیمن و سیفەتی مۆرفیمیان بە زەقی دیارە کە یەکەی بچوکن و مانادارن و رێزمانیو داریژەرن.

ب ـ ناوگر (ناوبەند) infix

ناوگر (ئەو مۆرفیمە یاریدەدەرانەن کە مانای خودیان نییە بەلاّم لە لێکدانی وشەدا هاریکاری دەکەن)[٣] ئەم مورفیمانە دەکەونە ناوەراستی وشەوە، ئەم جۆرە مۆرفیمە لە زمانی کوردیدا لە وشەی سادەدا نییە، تەنیا لەگەڵ وشەی لێکدراودا دەردەکەوێ ئەم مورفیمە بەزۆری دوو وشەی لە سروش نزیك بە یەکتر دەبەستێەوە وەکو لە دەنگ (چرپە چرپ)، (دەنگە دەنگ)، (پسەپس).

لە رەنگ (زەردو سوور)، (رەش و شین) لە شتی سروشتی، (بەفرو باران)، (ئاوو ئاگر)، (باو باران)، (دارو بەرد).

ئەم مورفیمانە ژمارەیان زۆرە کە ئەمانەن (ە، و او، ان، بە هو، ....هتد) کە زۆر جاری وا هەیە بە ئامرازی بە ستنەوە یا پریپۆزیشن لە قەلەم دەدرێن. چونکە ئەم مۆرفیمانە بە زۆری مانا نەگۆرن وا بە خەیالی زۆربەی نووسەران دا دێ کە ئامرازی بەستنەوە بن وە یا پریپۆزیشن بن (حرف جر).

ئەو وشانەی ئەم مۆرفیمانە دروستی دەکەن، گەر ماناکەشیان جیاواز بێ بەم شێوەیە نابێ کەماناکەی بە تەواوی لەگەڵ دوو وشە سادەکەیدا جیا بێ. ئەم مۆرفیمانە دوو ناوی سادە دەکەنە لیکدراو و ئەو وشانەی پەیدا دەبن یا ئاوەلناون یا ئاوەلفرمانن یا ئاوەلکاتن یاخود ئاوەلناوی شوێنین. ئەم جۆرە لە زمانی عەرەبیدا زۆرە بە تایبەتی لە (جمع تکیسر) بۆ نموونە (جبل، جبال)، (کلب، کلاب)، (دفتر، دفاتر)

جـ ـ پاشگر Sufix

ئەم مۆرفیمانە دەکەونە دواوەی وشەوە، ژمارەیان لە کوردیدا زۆرە، وە زۆربەیان مۆرفیمی داریژەری مانا نەگۆرن. وە هەندێکیان مۆرفیمی دارێژەری مانا گۆرن. بۆ نموونە مۆرفیمی (ەر) دەچێتە سەر چاوگی فرمان ناو دروست دەکا.

| فرمان | چاووگ+ | پاشگر (ەر) |
| --- | --- | --- |
| نووسین | نووس | ەر = نووسەر |
| خوێندن | خوێن | ەر = خوێنەر |
| راکردن | راك | ەر = راکەر |

مۆرفیمی (چی) ناو دەگورێ بۆ ئاوەڵناو

کەباب + چی = کەباچی

ئوتو + چی = ئوتوچی

ئاژاوە + چی = ئاژاوەچی

د ـ جێناوی کەسی لکاو:ـ

ئەم مۆرفیمانە دەکەونە دواوەیی مۆرفیمی سەربەستەوە جێناوی کەسی لکاو دەکرێ بە دوو گروپ (تاك و کۆ)

| تاك | کۆ | |
| --- | --- | --- |
| م | مان | کەسی یەکەم |
| ت | تان | کەسی دووەم |
| ی | یان | کەسی سێیەم |

کاتێ هەر مۆرفیمی لە گروپی تاك دەچێتە سەر هەر ناوێ ناوەکە لە حالەتی تاك دەگورێ بۆ حالەتی کۆ یا حالەتی هەبوونی کەسێ دەگورێ بۆ کەسێکیتر

باوك + م = باوکم (باوکی من)

باوك + ت = باوکت (باوکی تۆ)

باوك + یان = باوکیان (باوکی ئەوان)

باوك + مان = باوکمان (باوکی ئێمە)

ئەم مۆرفیمـانە مانایەکی تایبەتی خۆیانیان هەیە و لە
چەشنی مۆرفیمی مانا نەگۆڕن.
هـ - نیشانەی تاك و كۆ لە حالەتی ناسیاو نەناسیاو دا:-

| تاك | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| ناسیاو | نەناسیاو | ناسیاو | نەناسیاو |
| ەکە* | یێ | ەکان | ان |
| کە | ێ | کان | یان |

ئەم مۆرفیمانەش كاتێ دەچنە سەر ناوێ تەنیا خاسیەتی
تاك و كۆ دەگۆڕن ،بێ ئەوەی مانای ووشەکە، ناوەکە، بگۆڕن:-

| پیاو | پیاوێ | پیاوەکە | پیاوان |
|---|---|---|---|
| هەرمێ | هەرمێیێ | هەرمێیەکە | هەرمێیان |

و - نیشانەی فرمان: دە (ئە)، ب
دە (ئـە) کە نیشـانـەی فرمـانی رانـەبووردووە، (ب) نیشـانـەی فرمـانی داخـوازیە. هەردووکیان مۆرفیمن و لە چەشنی مانا نەگۆڕن، كاتێ دەچنە سەر فرمان مانای فرمانەکە ناگۆڕن، بەڵکو تەنیا حالەتی رابووردوو دەکەنە رانەبووردوو یا داخوازی

| فرمانی رابووردوو | رانەبووردوو | داخوازی |
|---|---|---|
| نووسی | دەنووسێ | بنووسە |
| کری | دەکرێ | بکرە |
| فرۆشتن | دەفرۆشێ | بفرۆشە |

ماناکانیان هەر لە قالبی خۆیان ماونەتەوە بێ ئەوەی هیچ گۆڕانی بەسەر مانای فرمانەکان دابێ.
سەرەرای ئەمـانـەی سەرەوە چەند مۆرفیمی تریش هەن وەکو نیشـانـەی پلەی بەراوورد کرن (تـر - ترین) کە لە چەشنی مانانەگۆڕن (گەورە گەورەتر گەورەترین).
مۆرفیم لە رووی کاری ماناوە:-
١- مورفیمی ماناگۆڕ drivitional
٢- مۆرفیمی مانا نەگۆڕ inflectional
مۆرفیمی مانا گۆڕ:- ئەو مۆرفیمەیە کە دەچێتە سەر ووشەوە مانای ووشەکەو پۆڵێو شێوەی دەگۆڕێ هەروەکو پێشگرەکان و هەندێ لە پاشگرەکان کە باسمان کرد. بۆ نموونە دەتوانرێ لە جیاتی «چوو» ووشەی «رۆیشت» بەکار بێ. بەلام کە پێشگری (هـەڵ)ی یا (تێ) - بچێتـە سەر مانـای ووشـەکە بەتەواوی دەگۆڕێ و ناتوانرێ (رۆیشت)ی لە جیاتی بەکاربێ.
چوو: رۆیشت
هەڵچوو: کرداری بەرز بوونەوەی شلە بە هۆی کوڵانەوە.
تێچوو: لەناو چوو؛ فەوتا
خستن: رووخاندن
راخستن: فەرش کردن
داخستن: قەپات کردن
مۆرفیمی مانا نەگۆڕ:-
ئەو جۆرە مۆرفیمانەن کە دەچنە سەر ووشە بێ ئەوەی مانای ووشە وەیا پۆڵی یاخود شێوەی بگۆڕن. ئەم مۆرفیمانە بە ئینگلیـزی پێیان دەووترێ inflection واتە ئاوسان یان زلکارە. کاری ئەم مۆرفیمـانـە تەنیا بریتیە لە زلکردنی ووشەکە بێ ئەوەی گۆرانێکی ئەوتۆ بەسەر ووشەکە دابێنێ.
پاشگرە بچوك كەرەوەكان (ۆلە، ۆکە، یلە، یلکە ....).
وە جێناوی کەسی لکاو و نیشانەی تاك و كۆی
ناسیاو نەناسیاو وپلەی بەراووردکردن و نیشانەی فرمان (دە، ب) لەم چەشنە مۆرفیمەن

| | ا | ب | جـ |
|---|---|---|---|
| جوان (قەشەنگ) | جوان | جوانیلە | جوانۆکە |
| نەرم | نەرم | نەرمۆڵە | نەرمیلکە |
| پیاو | پیاو | پیاوەکە | پیاوەکان |
| زیرەك | زیرەك | زیرەکتر | زیرەکترین |
| خوشك | خوشك | خوشکم | خوشکت |

ئەگـەر چاوێ بە ووشەکانی ستوونی (ا) بخشێنین، دەبینین مانـای تایبەتی خۆیانیان هەیە، مورفیمی سەربەستن، وە لە ستوونی (ب ، جـ)دا پاشگریان چووەتە سەر بەلام ماناکانیان نەگـۆراوە. بە پێچـەوانـەی مۆرفیمی مانا گۆڕ کە چووە سەر ووشەی (چوو) ماناکەی گۆری. بەلام لێرەدا ووشەی جوان لە هەر سێ ستوون دا (ا، ب، ج) ماناکەی نەگۆراوەو هەر بەمانا قەشەنگ ماوەتەوە، هەروەها ووشەکانی تریش.

وە هەندێ مۆرفیم‌هەن هەردوو سیفەتیان هەیە واتە مۆرفیمی ماناگورو نەگۆڕن. لەوانە مۆرفیمی (گە) ـ (گا)

ڕێ: ڕێگە ڕێگا
جێ: جێگە جێگا | مانا نەگۆڕە.

سەرباز سەربازگە
کار (ئیش) کارگە (کارخانە) | مانا گۆڕە
پرس پرسگە

وە هەروەها مۆرفیمی (ە) وەکو لە:ـ

کوڕ کوڕە
کون کونە | مانا نەگۆڕە

هور (گێل) هورە (چلەی گەرما)
پار : پارە | مانا گۆڕە

زنجیرە مۆرفیم و چەند ڕاهێنانی:ـ

گەلێ جار وا ڕێکدەکەوێ لە دوو مۆرفیم زیاتر لە دوایی یەکتر دێن وە هەر مۆرفیمی لەم مۆرفیمانە مانایەکی تایبەتی بە ووشەکە دەبەخشێ و مانای ووشەکە دەگۆڕێ، گەر لە چەشنی مۆرفیمی مانا گۆڕبن.

وە لەم ڕاهێنانەی خوارەوە سروشتی مۆرفیم لە رووی کارەوە بە دیار دەخەین

١ـ پێك داچووەکان

پێك: پێشگرە مۆرفیمی ماناگۆڕە

دا: پێشگرە مۆرفیمی مانا گۆڕە

چوو: مۆرفیمی سەربەستە. ووشەی رووتە

ەکان: پاشگرە مۆرفیمی مانا نەگۆڕە.

چوو: مانای (ڕۆیشت)ە

دا: ووشەی (چوو)ی لە مانای (ڕۆیشت گۆڕی بۆ مانایەکی جیاواز ڕنزم بوون؛ داکەوتن)

پێك: مانای (داچوو)ی گۆڕی بۆ (لێك دان، شەڕکردن)ەکان: نیشانەی کۆی ناسیاوە.

کەوابوو ووشەی (پێك داچوون) لە چوار مۆرفیم پێکهاتووە دوانیان پێشگرن لە چەشنی ماناگۆڕن وە مۆرفیمێکی سەربەست کە ووشەی بنچینەییە وە ئەوی تریان پاشگرە لە چەشنی مانا نەگۆڕە.

٢ـ هاوسەنگەرانیان

هاو: پێشگرە مانا گۆڕە

سەنگەر: ووشەی بنچینەیی‌یە (رووتە) مۆرفیمی سەربەستە

ان: پاشگرە: مۆرفیمی مانا نەگۆڕە

یان: پاشگرە: مۆرفیمی مانا نەگۆڕە

سەنگەر: ووشەی بنچینەیی‌یە واتای (خندق)ە

هاو: مانای ووشەی (سەنگەر)ی گۆڕیوە بۆ (ئەو کەسەی لە سەنگەر دایە)

ان: نیشانەی کۆی نەناسیاوە. مانا نەگۆڕە

یان نیشانەی جێناوی لکاوە (کۆیە) بە مانای ئەوان هاوسەنگەر = ٤ مۆرفیم

یەك مۆرفیمی ماناگۆڕ (کە پێشگرە). دوو مۆرفیمی مانا نەگۆڕ کە هەردووکیان پاشگرن. وە ئەوی تریان مۆرفیمی سەربەستە کە ووشەی بنچینەیی‌یە

٣ـ مندالۆچکە

مندال: مۆرفیمی سەربەستە بنچینەیی‌یە

ۆچکە: پاشگرە، بچوك کەرەوەیە، مۆرفیمی مانا نەگۆڕە

دەرئەنجام:ـ

لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە مۆرفیم بچوکترین یەکەی ماناداری ڕێزمانی‌یە. وەبەشێوەیەکی گشتی ئەم سیفەتانەی هەیە:ـ

١ـ ناتوانرێ مۆرفیم بۆ پارچەی لە خۆی بچوکتر لەت بکرێ و پارچە لەت بووەکەش هەر بەماناداری بمێنێتەوە.

٢ـ هەندێ جار مۆرفیم لەیەك تاقە دەنگ پێك دێ وەکو (م، ی، ت) کە جێناوی لکاوی کەسی تاکن.

٣ـ هەندێ مۆرفیم قەبارەیان یەك برگەیە وە هەندێکی‌تر دوو برگەن وەیا زیاترن.

٤ـ هەندێ جار مۆرفیم بە دوو شێوە ڕفتار دەکا (ڕێزمانی‌و دارێژەر)

٥ـ کاری سەرەکی مۆرفیم دروست کردنی ووشەی تازەیە، جا گەر مۆرفیمی مانا گۆڕ بێ یا مانا نەگۆڕ.

سەرچاوەکان:ـ

١ـ ووشە رۆنان لە زمانی کوردیدا د. ئاورەحمانی حـ حی مارف. ل[٣٢]

٢ـ An Introduction To Language P.143

٣ـ ووشە رۆنان لە زمانی کوردیدا د. ئاورەحمانی مارف ل[١١]




# خنگه ملانێ



○ عەزیزی مەلای ڕەش ○

پیادەرۆکەی پێش پیشانگاکە لە پیاوو ژن و مندالّی پارچە لە جمەی دەهات، دەرزیت بهاوێشت بووایە بە عەردی نەدەکەوت. لە هەوەلەوە بە مەراق و تاسەوە خۆم کوتاناو قەرەباڵغی یەکە:

ـ ئەرێ ئەوە چ دەدرێت ؟

ـ ئێمەش وەك تۆ.

ـ دەڵێن کرێشەیە.

ـ بابـە خۆ نەبووە هەقایەتی مێشێ، دونێ و پێرێ لە سەریەك کرێشە بوو.

ـ چشتێك هەر هەیە.

هێشتـا نەگـەیشتبـوومـە ئەستوورایی عەشاماتە کەهالاوی گەرمی، کە دنیا برکی دەهێنا بەر چاومی دەغەمراند، هەناسەو بۆن ئارەقەو گرمخایی خەڵکەکە ڕەقیان ڕاگرتم. کەوتمە جیهانی دوو دڵییـەوە: «بـچـم، نەچم» پێیـەکم کەوتـە پاش، یەکم کەوتەپێش. دوای مرخێش مرخێشی هەڵگێرو وەلگێرو شی کوت کردنی دڵ: «ئەمنێکی وەزن (٤٨) کغم، بایەکی تۆزێك بە قاییم بێت دەمبات، نە خۆش‌وبەدەردەدار بە داوو دەرمان وەستاو کوو بەرگـەی ئەو گیرمـە قوونـانێ‌یە دەگرم!؟ خۆ گیانی خۆشم لە دەشت نەدیتتەوە!» لەزگ بوو بەرێی خۆم دا کزەکەی بۆ بکەم لە نکاورا ئەم دەنگە، کە ڕۆژی خوا نەبوو سەرکۆنەو هەراسانم نەکـات لە گوێم زرینگـاوە! پیاویژگە خەڵکی خوا بەقوماش و کراس و پیـاڵەو فەخفووری و فاسوولیاو کەل و پەلی جەمعیە خەنی بوون تەنیا ئێمە نەبین! لای خۆت چەند ساڵ و حەیامە ئیشتراکت هەیە ئەوجا هیچیش! تا خاوەنی تووبین ئێمە هەر ئەوها لە هەموو چشتێك بێ بەشین !

ـ ئافرەت ژنی باش بە ئەمنی لە خۆ ڕا نیـو بێ وو جوود سرە گرتنیان نەگو تووە !

ـ وا دیارە بە ژنانیشت تێ نابێت!

ـ ئـ... هـ ئەگـەر بەژ نانم تێ ببایە تووشی ئەو پرتەو بۆڵەی جەنابت نەدەبووم!

های لە ... های لە دۆ شاوێ.

« ـ تەنیا هەر جارێك لۆسونەت بمان دیتبایە!» چارم ناچار بوو: «ئەمری خوای ڕەزای حەق! با ئەو جارە هەرلۆ جەرباندن و دڵ دا کەوتن بێت» هێدی هێدی خۆم بۆ ناو قەرە پەستانە چرەکە

رەپێش کرد:
«جاران چابوو سرە دەگیرا، دوو کۆلانی ئاسن لۆ پیاوو ژنان هەبوون! سرە گرتنەکە لۆ پیر وبێ شنگان زۆر باش بوو. غەدرو غدووری تێدا نەدەکراو ئاواش نەدەبووە رۆژی مل هورو لاسارو کەرئەسپان.
ردنگە بە هۆی ئەو ئاژاوەو کەر بازاریە زۆر شت لە کەلێنی پەنجان بخریتە خوارەوە. ئەگەر دزو خاوەن مالیش یەك بن گای لە کولانکە ناوادەکەن. زۆر لە گینیشە! ئەگەر نا ئەو مندالە...
نـ..هـ بلێم چی؟ دونیـایـەو هەمـوو شتێکی لێ روو دەدات خوداش نەبێت کەس نازانێت»:
کاتێك دەرگای پێشانگاکە کراوە هەزارە زیلە کە لێکرا، لە هەموو لایەکەوە تەکانیان دا بەر خۆیان. چەشنی مەر ئالیك دان هریان کردە ژوورەوە. هەر بابا بوو بە هەموو گورو هێزیەوە هەولی جونە پێشی بوو. بووە پاڵ پێوەنان و قەرەپەستانێو ململانێ کێشمە کێش و هەللایەك ئەو سەری دیارنە بێت، سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسیەوە. هەریەکە ئەوی دیکەی تاوانیار دەکرد و لە ژێـر لێـوا نەوە، جار جارەش، بەبێ پەردە قسەی نا بەجای ناراستە دەکرد. بەلام کێ تێ دەگەیشت؟ لەبەر زۆر خزینە پاڵ یەك کەس بەرنـە دەبـووەوە ئەگینـا تا رۆژی واوەیلایێ قیت نەدەبووەوە. یاغر، یاغر، بەبێ خوایشتی خۆم لەگەڵ پالدان و هو رووژمی شالاوەکە بۆ پێشەوە دەجوولامەوە. نۆ باتیش پێیەکانم لە زەوی بەرزە بوونـەوە. هەر هێندەم خۆشی بوو تاگەیشتمە کەرخی دەرگاکە، لە هەر لاوە تەنگیان پێ هەلچنیم و هەر وەختا بوو هەمـوو دەندەکانم لە باریەك بچن «لە بێ یەغباریش کە کەوتوومەتە نێوان دوو سێ زەلامی بەوەج و زەبەلاح و چەترە فیـل هەر کەمێـك بە تونـدی پالدەنـەیـەك دەم تولخێننەوە!» پالدانـەکـە هەر دەهـات بە هێـز تر دەبوو. لە حەژمەت ژانی پەراسووەکـانم ئاگام لە هەموو شتێك برا. دەت گوت لە مەعبێن دوو بەرداش دامە تالە توانام دانە بوو بەستەمیش خۆم بەملاو بەو لادا بجوولێنم.
بەخۆم نەوەستام، لاو وابوو دەبێتە هۆی رزگاریم تا دەنگم تێی دابوو هاوارم کرد.
ـ کورە هێواش، بابم هێواش، کورە پیاوی باش بن پالمەدەن، بابم پالمەدەن.
بێ هوودە بوو. نەفسی نەفسییەکی وابوو کەس گوێی بە کەس نەدەدا. دەم گوت هەنـووکـە ناهەنووکە قەبرغەکانم دەگەنەوە یەك. زۆرم بۆ هات و چارەم نەما، بۆ ئەوەی «سەعید حەسەن» کە دەستــە راستــەم کەوتبــوو قیچێـك لێم دوور کەوێتــەوە چەپەلۆکێکی حێلم خێواندە سەرو گوێلاکی. پێشتر بەرێزەوی دەمنـاسی «خاوەن شەهادەی شەشی سەرەتایی و فەرمانبەری شارەوانی و کەلەگەت و چوار شانەو تێك چەقی» سەرە ئانیشکە رەقەکەی لە تەنکێشم گیر کردبوو، زۆر نەمابوو دوو بەدەری بکات:
ـ دەبەس بمدەرە بەر پالەسوان مردووت مرێت!
ئاورێکی کشتی لێ دامەوەو بە خیسێکەوە پێی گوتم!
ـ خودا بتگرێت ختو خۆرا ئەو شەپەت لۆ لێدام!
بە هەلچوونەوە گوتم:
ـ هێشتا پێی دەوێت! وا لە زگەکەلەکەم کون بکەیت!
مالێ ئاوا ئانیشکەکەی وەلانا هێندێك پشووم هاتەوە بەرو ویستم تەوازووی لێ بخوازمەوە کەشروی ژان لە دەستی دەرچوواندم کە چی ئەو لەگەل رەنگ پەرین و شین و مۆر هەلگەران دا دەست پێشخە ری کردو چی تێ نەهێشتەوە:
ـ غێر موعەلیمیت!
دەت گوت خەنجەرێکی ئاراستەی دلم کرد، یەکسەر بەر چاوم تاری بوو، رق و دەغـەز لە هەناوم بلقیان دا. زەمینم تەواو لە ململانێکە نەماونیازم وابوو بەو پەری غەزەبەوە پێی بلێم «دیارە موعەلیم..» بەلام داغمەی حیزی و سەلامەتی، بەبێ خوایشتی خۆم هەر لە کاتی مندالیمەوە بە نیو چەوانمەوە لکاوە بۆیە هەر زوو «بـەلەعنـەت بێت شەیتـان ها..!» دای مرکـانـدمـەوە «دەو لە دەوی کێ دەنێت مال وێـران!؟ کابـرایـەك بە خۆی نزمترین وەزیفەی هەبێت ئەوجا موعەلیم

کە رەو رەوی پێشکەوتنی جیهانە و میللەتانی سەر گۆی زەوی شانازی پێوە دەکەن بە هیچی دانێت چی لەگەل دەگوترێت! هەر چی لەگـەل بلێی بەلاشەو هەر خۆت زەرەر دەکەیت! ئەو جەمعیـە کەشێـوەی گشتی وەرگـرت بەسـەدان فەرمـانبەرو مامـۆستـا قەشمـەریـان پێ دەهـات و بە چاوێکی سووکەوە سەیریان دەکردو هەر بە خەیالیشیان دانە دەهات کە رۆژێك دا

دێت بەتاسەوە بەشداری دەکەن، کە چی لەو دوو سێ ساڵەی
دوایــی دا، کە بازاڕی ڕەش پەرەی سەنــد، بۆ ئەوەی شت
وەربگــرن و بەقازانج بیفرۆشنەوە مە گەر بە دەگمەن تاکو لۆ
کیشیــان نەمــان. ئـ.. هـ کاکی سمێڵ بابریشم یەکێکە لەو
جۆرە کەسانەو ڕۆژی خوانییە بەر دەرگەی ئەو پیشانگایەی
بەقۆنتەرات نەگرتبێت!» چەندی بڵێی لە خۆم بە قار داچووم:
«جـا توخـوا وا ئەو ئەوهـایە ئەمن لۆ!؟ ئـ.. هـ واپێ دەچێت
خوداڵێ گۆڕی بم!، ئەگەرنا لە گەڵ یەکێکی ئائەوها نرخ ڕیزم
نەدەگـرت!» هەر کە پێ یەکـانم لە سەرعـەتـەبـەی دەرگاکە
سەنگرانەوە کافر بە حاڵم نەبێت. پاڵەپەستۆکە خراتر بوو. واڵە
قالب درام لە باس نابێت: «ئەو گۆڕەشارەی کە باسی دەکەم هەر
ئەوهــا دەبێت!» دوای ئاخ هەڵکێشـانێکی درێژی پەشیمانی
ماسەرز نشتی خۆم بکەم: «دافەتێم، دارزێم، بتورێمەوە سەت
قات ١٠، حاڵە باشترە! کە بێتە قسانیش بە خۆم دەڵێم تەرەماش!
خوزی بە خۆزی داران ئەو......» بەڵام تازە بەتــازە لەگـەڵ
چەوان چ ناکرێت وداری خۆزگەش بۆ کەس بەری نەگرتووە،
لەبەر زۆر چوونــە پاڵ یەك هەر دەهــات زیاتر تەنگە نەفەس
دەبووم تاوای لێ هات ئاگام لە ژان و مان نەماو خوا خوام بوو
بەس هەناسەم نەگیرێت. ڕەنگ و هۆری دڵ لە ناو قەفەزەی سنگم
دا وەك لاو ژۆکەی قەرێتەی ملی هێستری باڵابانی پێشەنگی
قەتار چیان، بە ئامان و زەمان دا کەسانی نەبوو: «ئەو ڕۆژەێی
بچم ئەو ڕۆیــە! نەخـۆش لە خۆم نەبـوو ئەو جاسوورە گوڵی
باخـانیشی بووە میوان! حەقە مستم ئەرێ بەخوا حەقەمستم
خراتریشم بە سەر بێت. توخوا ئەوەم لەچی!؟
لە چیم کەمە، ها..!؟ بەرەفاهی‌یەت دەژیم و مەعاشەکەم سەرو
زیـدمیە! ئـ..هـــ تەنیا هەر لەبەر..! ئاخ.. خ خ نازانم بڵێم
چی!؟ هەر ئەوەنــدە دەڵێم پیری وهــەزار عەیب!» بەخـۆشم
نەمزانی چۆن گەیشتمە ژوورەوە. چ چوونە ژوورێك؟ دەت گوت
بە حەوت کەسـان لە خرتـۆرەیـان وەر داوم. هانکـە هانـك و
مشـەمشم دانـەرێیەك دەرۆیشت، مێشکم زرینگ و هۆری
پێکـەوت. ئەوەی هێـزو توانا بوو لە جەستەم دا باریان کرد.
هالاوی گەرمی ژوورەکە هێندەی دی هەناسەی سوار کردم،
لەشم سەرتـاپـا لە ئارەقـەدا کەســەر بەرەوخـوار بازرەقــەی
بەستـابـوو، زرچـەی دەهـات. چاوم کەوتە جیهانی ڕەشکەو
پێشکـەو غەمـرانـدن. یەکســەر ماسـولکـەکانی لا ملم ڕەپ
ڕاوەستان و بەقەدەر پەنجە تووتە خۆیان دەرخست و هاواریان
لێ هەستا و ژانە سەرێکی توندم تووش بوو. دوو جار ملم بەملاو
بەولا دا باداو تەقـەیـان لێـوەهات بەڵام بێ سوود بوو. «بە
سەلامـەتی قوتـار بامـایـە خێرێکم لە خۆ دەگـرت! ئـ... هـ
سەلامـەتی چی؟ دوای ترێ خەپشـەی برێ. بروانـاکەم بە
حەفتەیەك پارێزو داوو دەرمان بێمەوە قایدەی جاران نەبەخوا!»
خێزێکی تاڵم قووت داوە: «بریا بە بریانی خودا دایکی مندالان
تی چاوێکی لەو سەگ بەحـەسـارە بایە، یا خۆد موسوڵمانێك،
لەسیری هەتاپیازی ورد و باریك، بەسەرو بەرلۆی بگێرابایەوە!
بێ گومان کەرەتێکی دی ژیانی لێ تاڵ نەدەکردم!».
عەنتیکەم بەو قسانە هات: «ئـ... هـ ئەوجا ئەو چ گوێی لێیە!،
لە شەر نییەو هەردەم شیری تیژەو هەتا ئێوارێش بۆی بڕێسم
و بڵێم «نێرە» ئەو لە سەر تەختە کە میەکەی خۆی دانا بە زێت
و دەڵێت: بیدۆشە!» باش بوو لە بەختانم بوو کت و خوا لەگەڵ
تەوژمی خەڵکـە کە تەرۆکی ڕاستـەم کەوتـەلای چامخـانەی
پیشـانگاکە، لەپەراسووەکانم تەواو دڵنیا بووم وتوانیم دەستە
سرە بۆرە خەت دامەیی یەکەم دەربهێنم و دەم و چاوو شان و
مل چاویلکەکەم پێ بسڕمەوە. لەبەر جامخانەکە ڕیزی من بووە
سەرەکی و چەنـد کەسـانێکیش زوو بە ئاکام گەیشتن خنکە
مەلانێیـەکە تۆزێك هێور ببووەوە. لە مێملەکەم بەملاوە کەسی
دیکە لە پێش نەما بوو، نارەزایی خۆی دەردەبری:
ـ دیارە هەر چشتێك لە جەمعیە بکرین بەرداخیشی لەگەڵ دایە!
ئەوا لەو مانگەدا سێ دەستە بەرداخم بەمل وەبکەن.
ـ ئەو هایە، خۆ چ بە زۆری نییە، ڕازیت باشە، ڕازی نیت ئەوا
بەچاوی خۆت دەبینیت سەتی وەك جەنابت وەستاون
وەمەنوونیشن،
عومەر مەمەند گەنجێکی لە دەورو بەری بیست وپێنج ساڵ داو
دەم و چاو ڕەقەڵەی کرووزاوی و لیر لیر دەت گوت خاڵۆزای لێ
داوە بە مرو مۆچی وەدەنگی زرەوە، لە کاتی هەویە وەرگرتن دا
ئەمەی گوت.
ـ بابە قەیدیناکات ئەگەر ئەو چشتەی لەگەڵی دەدرێت تۆزێك
نرخی هەبێت، بەڵام دەستە پیاڵەیەك خۆی هەیە تاکو بەرداخی
لەگەڵ بدرێت!.

عومەر هەر کە زانی قسەکەی راستە نەوی لێ کردو بە نەرمی‌یەوە:
- کاکە ناچارین.
- لەبەر چی؟
- بەرداخێکی زۆرمان لەمل کەوتووە و کەس دوو فلووسی پێ نادات.
هۆیێکم لە خۆم زانی «نەهۆ.. وەهــ.. ئەو بەزمە کەینێ پەیدا بووە!؟ پێشتـر وانـە بوو، دیارە هەموو چشتێك گۆڕاوە! ساڵی ١٩٦٧ ئەو دووکانە هەرەوەزی‌یە بۆ راست کردنەوەی گوزەرانی مامـۆستـایـان دامـەزرا. تاکەل و پەلی پێویست بە قیست و هەرزانترین نرخی بازاریان بدریتێ و قانزانجەکەش بۆ خۆیان بگـەرێتەوە. ژمارەی بەشداربووان ئەو کات سەری لە «١٥٠» ئەندام زیاتر نەدەداو دوا کەسیش من بووم. ئەوا پاڵ بە حەڤدە ساڵ دەدات بە هەمـووی دەجـار چشتم لێ نەکـریوە، بەڵام سوودیشی بۆم بووە. وا بوو ساڵی ١٩٧١ موبـەریـدەیەکم بە قیست وەرگرت و لەو ساڵانەی دوایی دا دوو سێ جار شەکرو چاو پاکەت، کە ئەو کات، لە بازار بەکوللەش چنگ نەدەکەوتن ئەو جا چ ئەو هاش کۆلك پێش قەرەور نەبوو واپێ دەچێت...»

- هەوی یەکەت.
دەستم بە هەمووگیرفانەکان داگێڕا نەبوو. دەگوت کوندە ی شەویم پێ داکرا لە جێگەی خۆم سارد بوومەوە.
- دەڵێم فەوی یەکەت!
دەستێکم هەر بەچـاویلکـەکـەمـەوە بوو، کە لەبـ مورسی جامەکانی، بەهۆی ئارەقەوە دەخزی، بە دەستەکەی دیم دوو جار و سێ جار گەرام نەبوو: «تازە پێم بوو، قاتی ئاسمان هەڵی نەکێشاوە!»
بەتوندی‌یەوە:
- مامۆستا لەگەڵ کێمە؟
بەگەران و چاشمیشی‌و دڵ ساردی و نەرمی‌یەوە.
- دیارە لەو هەللایە لێم کەوتووە!
بەنیمچە توورەیی‌یەوە:
- ئەدی سەعاتێکە لۆ دەنگ ناکەیت؟ بێ هەوی‌یە نابێت.
هاتە سەرزارم:
- لۆ؟
- لۆی ناوێت، ئەگەر بە هەوی‌یە نەبێت زۆر کەسی وەك جەنابت هەیە حەفتەی دوو سێ جار یەك چشت وەردە گرێت.
- ئەمن لەوانە نیم.
- ئەو قسانەمان زۆر گوێ لێ بووە.
- کورە پیـاوی چاك بە، خودا دەزانێت تاگـەیشتـوومـە لات هەزارتفم لە خۆم کردووە! برواش بکـە یەکەم جارمەو قەدری عافیەتم زانی‌و تاماوم جارێکی دی ناماقوولی ئەوها ناکەم.
بەروو گرژی و دەنگی بەرزەوە:
- خۆ تورکی ناڵیم.
بەرۆکم بەرنەداو گوتم:
- کاکی برا شەرت بێت لەشەرتی پیاوان ئەگەر بزریش بووبێت سبـەینی یەکێکی نوێ دەر دێنم و بۆتی دێنم، بەس دەست بە ئاڵم مەنێرەوە.
. مامۆستا قسە لەزار دەردێت و سەری خۆت لە بەردی ئەلحەد مەدەو ئیشمان زۆرەو چیدی رامان مەگرە.
ئەمەی گوت رووی لەوەی دواوە کردو گوتی:
- کاکە تۆ هەوی یەکەت.
هەتـا ئەو کاتەش لەسەین و بەینی گەران دابووم. «عەجاییب ئەدی چی لێ هات!؟» پێش خۆتێ هەڵقورتانم بۆ ناو عەشاماتەکە لە بەرکی کراسم دابوو، لە بەرگەورەیی چواریەکی بە دەرەوە بوو، ترسی کەوتنم لێ کرد و خستمە باخەڵەوە. تومەز بە هۆی پاڵدان خزی بوو، لە ئاست تیلەقـەی پشتم سەنگـرا بوومەوە. کاتێك دەستم پێ کەوت بافرەی گوراخ خۆشی وەك مارەزیو بە ناو چی دەماری لەشم بوو داگەراو پشوویکی شادیم خواردەوە. لەئـارەقـەدا هەڵگەرابوو، هەر ئەوەتە نەبوو بووە هەویر. وەك دوژمنی بابە گەورەی بم چرو چاوی لێ گژ کردم و بەسەر بادان لێی وەر گرتم و:
- دیارە قەشمەریمان پێ دەکەیت!
- من و قەشمەری کردن!
لە کاتی پەر ئاوا کردنی دا لە جاران خراتر، نیو چەوانی هەر هێندەی دوو پەنجانێ لێ مابووەوە لە بەرە خۆیەوە مرتاندی،
- تو خوا هەوی‌یە هەڵگرتن ئەوها دەبێت!؟ لای خۆت مامۆستایت.

# لەبەردەم ئاوێنەکەدا

● رەووف بێگەرد ●



«دەی.. لێرەدا هەمـوو لەشی خۆت ئەبینیت، تاڵە سپیـەکـانی سەرت، دەم و چاوە چرچـەکەت، دەماری زەق و زۆپی پشتی دەستت، غەبغەبەی داکەوتووت، قاچە باریکەکانت، ئەی چیت ماوە؟ ئەو لاوەی کەپێی ووتی پیرێـژن.. ئای کە ووشـەیەکی کوشنـدەیـە! دەی پەنجـە بخـەرە سەر برینی ئەو خەنجەرە ژەهراویە، برینێکی تازەیە، تك تك خوێنەکەی لە ناو لەپتەوە بە هەمـوو لەشتـا بگـێڕە، تا ئەبێتـە لینجـاوو سەرتاپای لەشت ئەتـەنێتـەوە، مێش تێت ئەدات، بۆن ئەکەیت و ووردە ووردە پارچەکانی لەشت لێك ئەترازێن، ووشەکە تاشە بەردێکی پتەوو قورس بوو، بەسەر لاشەیەکی نیوە مردوودا هات دوا جووڵەی بری، یان ئاگـرێکی لە ناکـاوی نێـو پووش و پەڵاشی وەرزی هاویـن، سووتـانـدتـی، کە ووتی پیرێـژن کاسی بوویت، لە شوێنێکی زۆر بڵنـدەوە کەوتیتـە خوارێ، لەبـەر خۆتەوە بڵمە بڵمێکت کرد، نەت زانی بڵێی چی، ویستت بڵـێیّ رۆڵە چیم لێ کردوویت وا ئەم ژەهراوەت بە گەروودا کردم، بەڵام بڵمە بڵمەکە

بوو بەچەند رەنگێکی تێکەڵاوو بەسەردەم و چاودا رژا، چەند جارێك سەرنجت دایە کورە لاوەکە، لەر قەوە بۆ

خۆشـەویستی، لە نفرەتەوە بۆ تەماشاکردنێکی پڕ لە بەزەیی، بەزەیی بە خۆتا، بە تەمەنتا، بەو ئاسۆ بێ کوتاییەی ژیانتا کە چاو برکـات بۆشـایەکی وەراقەو دوای ماوەیەکی کەمیش وەك داری پیرو رزیو کلۆر ئەبێت، ئەکەوێت و ئەبێتە خۆڵی سەرە رێ.

تۆ لە ئۆتـومبیلەکـەدا هەر گینگڵت دا، چاوت بە جامی پێشەوەوە روا، هەموو دنیا لەبەر چاوتا بوون بە تاڵە سپیەکان و چرچ و لۆچەکەی دەم و چاوت، ئەمەندەت هێناو برد تا ژیانت وەك دۆزەخێـك هاتـە بەرچاو، جا ناهەقتە؟ سی ساڵ بێوەژنی بەدەم خۆشە، تەنیا دوو ساڵ باسکی پیاوێك سەرینی گەردن و سەرت بوو، سی ساڵی تەواوە لەشە گەرمەکەت بۆتە شەختەیەکی ساردو سڕ، شەوانە هەر خۆت گرمۆڵە کردووە، دەیان و سەدان جار بەدەم یادی ئەو دوو ساڵەوە گینگڵت داوە، هەنـاسـەی

ساردو گەرمت هەڵکێشـاوەو زەمـانی ئاگرینی ئارەزووەکانت بە هەمـوو لەشتا گێڕاوە، لست و یانەتەوەو پاشان وەك دووپشك پێیـانـەوە داوە، سی ساڵ خەم و نائومێدی، ئازارو فرمێسك. شەودانـە دەم رۆژو هەڵکـورمان بە سەر خولیاو خەمەکانتا، شەوانی زستـان لەگەڵ لوورەی رەشەباو، شەستەی باران و، هەورە تریشقـەی بە سامدا تا بەرە بەیان چاوت لێك نەدەنا، ئەوانـت دەکـردە خەوو خۆیشت هەر دوو چاوی چاوەروانی بوویـت، رائـەپـەریـت، ئەتـرسـایت، وات هەست دەکـرد مۆتـەکـەیـەکت بەسـەر سەرەوەیـەو ئەیـەوێت بتخنکێنێت، ئەلەرزیت، ئەکەوتیتە ناڵەو هاوار. لە سەرەتادا دایکت ئەهات و لێفەکەی لە سەر لا دەدایت، وەك نەخۆشێکی لەرز لێ هاتوو لە ژێـرەوە چاوت ئەکـردەوەو لەنـاو چاوی دایـکتت ئەروانی، ئاسـوودەییـەکـەت تێ دەگەرا، دایکت پێی دەووتی: کچکەم چیتـە؟ وەڵامی تۆ تەنیـا فرمێسکە درشتەکانت بوون کەلەنێو پەنجـەی دایکتـەوە بازرەقـەیـان دەبـەست و دەکەوتنە سەر سەرینـەکـەت. ئەزانیت هەموو شەوێك هەناسەت بەو شوێن فرمێسکانەوە دەناو ئەو لایەی سەرینەکەت رەق بوو بوو، کەچی تۆ هەر بەسەر ئەو لایەدا سەرت دەنایەوە. وەك ئەو منداڵانەی کە بە بۆنی دایکیان رادێن دەخەون و هەر کە لێیان برا بە ئاگا دێن. ئەمەندە ئەمە دووبارە بووەوە تا دایکیشت بێزار بوو، ئیتر نەدەهاتە سەرت و نە چاوەکانی ئاسوودەییان دەدایتێ.

ئەی ئێستا؟ دەی پیرێژن.. ئەوە قژە سپیەکەی ناو چاوت، ئەوە تاڵێك و دوان و [illegible] لە یاڵی ماینی پیر ئەچن، سپیـەکی قێـزەونن، لە خوری ناکـەن، هەموو تاڵێکی خەمێکە، یادێکی تاڵە، بربەنێکە یادگارەکانت ئەکرێنێ و پاشان دەیانداتە دەست رەشەبای ناسۆرو ئازار، ئای پیرێژن.. ئێستا کەرەسـەیـەکی لە کار کەوتـوویت و لە لاڕێدا فڕێ دراویت، هەرچی رێبـوارێك تێ دەپەڕێت بە چاوی سووکەوە تەماشات دەکـات، وا ئەزانـێت تۆیـەکی شکـاو کەمت بە دەست ئەم گەردوونەوە چەشتووە، ئازارت کەمن، برینەکانت کەم قووڵن. تۆ ئێستـا لەو پاپۆڕە شکاوە ئەچیت کە لە بەندەرێکدا لەنگەری

کرتووە، هەر شەپۆلێك دێت، بەهێز بێت یان نا پارچەیەکت لێ دەکاتەوە. پەیکەرە بێ گیانەکەیشی چەند چڵۆسکێکە لە دواوە هەڵنەڕوانێت. ناودوەی چڵۆسکەکان پاشماوەی خۆراکی کۆنە، تا دێت زیاتر بۆگەن دەکات، کەروو دێنێت، دارو دیوارەکانی ژەنگ دەگرێت. پاشان هەرەسی دێنێت. ئای پیرێژن.. دەك ڕۆڵە دەمت بشکێت بو ووشەیەك کە گوێمت پێ زرنگاندەوە، بەڵام دەباشتر تەماشای خۆت بکە، خۆ ئەمە ڕاستیەکە وەك سێبەرەکەت لە گەڵتایە. بۆ لێی را دەکەیت؟ تازە دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ گەنجیەتیو یادگارەکانی جوانیت؟ نەء، ئەوە مەکە. ئەو یادگارانە گالیسکەیەکی شەق و شڕن و دارەمەیتی ئێستای تۆیان لە سەر شانە، ددی.. ئەوە فرمێسکت لە چاو کەرا. هاتە خوارێ. کەوتە سەر دەستت.

کەوتە سەر دەمارە شینە دەرپەڕیوەکان، پەنجە باریك و هەڵقرچاوەکان! هەڵیان بگرەوە. ئەو سوێراوە لە دەمت رادە، بێجگە لە سوێریو تاڵی کەی ڕۆژێك شیرینی میوانداری کردوویت؟ ڕاستە مێردەکەت قۆز بوو. خۆشی ئەویستی، دوو ساڵ وەك منداڵ هەڵی گرتیو دانایەوە، بەڵام هەر ئەو مەرگە کوتو پڕەی ئەو بوو کە ئەم چارە نووسەی لە تەوێڵ نووسیت. بگری. سەری خەمەکانت ئەمەندە پڕن جێگای چی تریان تیا نابێتەوە، خۆ ئەو تاقە منداڵەیش کە لە بارت چوو ئەگەر بمایە ژیانی تۆیش گۆڕانێکی تێ دەکەوت، بەشێکی ئەم داماویەتی دەرەواندەوە. ئەم گەردوونە هەموو گیانی تاوانە، ئاخ.. سەرم کاسەو ناو دەمم ژەهرێکی ڕووتی ئەم سەردەمە نابووت و سۆزانیەیە کە بێجگە لە خەنجەر ناتوانێت چی دی بۆ گەردن و دەروون و دڵ داوەشێنێت، ئەوە ئاوێنە باڵانماکە لەبەر چاوتا لێڵ بوو؟ چاوت بسڕەو خۆت باشتر ببینە، ئەمە ئاوێنەی ڕاستیە، درۆی هەموو لەشێك دەردەخات و پاشان گیانی سپی دەکاتەوە، ئاوێنەی دان پیانانە، تەنیا شتێکە کە لەبەردەمیدا بە چۆکا دێیت و وەك نێچیر لەبەر پێیدا بکەویت، ئەژنۆی هەموو یادگارەکانت دەشکێنێت و دەیداتە بەر چەرخی ئێستای خۆی، ڕابووردووت.. ئا.. ڕابووردووت بەی دەست بکات، کێت ما نەمرێت؟ باوکت، دایکت، خوشکە گەورەکەت، ئێستا ماویتەوە خۆت و خۆت، تاق تاقکەرەیەکی شەوانەیت، مەلی ناو قەفەزێکی تەنگ و بەندیەکی ناو چوار دیواری ئاسنین. کە ویستت بای باڵێکی خۆت بدەیت ئاوا بە تیری ووشەیەك، مەیلێ، خۆ تۆ تازە پێت ناوەتە تەمەنی پەنجاوە، ئەمە کەی تەمەنی نزیك لە مەرگە! خۆ تۆ ئەمەندەیش گەنجیەکی خۆشت ڕا نەبوارد، ژیانت هەر مەحروووم بوون بوو، چیت هەیە؟ ماڵ، مێرد، کەسی، ڕابووردوویەکی دەوڵەمەندی پڕ لە خۆشەویستی؟ هیچ.. هیچ، ددی دەست بگرە

بەم لاو ئەو لای ئاوێنەکەوەو وەك بێشکە بیجووڵێنە، وێنەکەت ڕابژەنە، پێت خۆشە، چونکە بێشکەیشت بە خۆتەوە نەدیوە، سەیری ئەو وێنەیەیش بکە کە لە ناو ئاوێنەکەدا دیارە، ئافرەتێك ڕمێکی بە دەستەوەیەو بەرەو سەر سنگی پیاوێکی کردۆتەوە، سەری ڕمەکە گەیشتۆتە سەر دڵی، کەچی پێ ئەکەنێو نیگایەکی بە مانای گرتۆتە ئافرەتەکە، دیارە ئەو نیگا پڕ لە خۆشەویستیە لە زەتی ڕمەکەوەیە. ئای! چیت لەمانە داوە؟ وەرەوە سەر خۆت، پیرێژن.. سەیرێکی مەمکە شلەکانت بکە، دەستیان لێ بدە، مەمکە چەقەکانت، پێستێکی داکشاون و بە ڕەگێکی باریك بە سنگتەوە نووساون، بۆ تاقە جارێك نەکەوتنە ناو دەمی منداڵێکەوە، تامی مژینیان نەزانی، گوێ مەمکت ڕەشیو چرچە، ئەوسا.. مەکەوەرەوە دوای یادگارە مردووەکان، ئەوانەی باری گرانی لەشی تۆیان گەیاندۆتە ئێرە، چ ژنێك مەمکی ناکەوێتە خوروو شیری تێ نازانێت؟ پڕ نابێت و لەژێر کراسەوە وەك کوارگی سپی هەڵناتۆقێت! کەچی تۆ وەك ژنێك ئەمەت بە خۆتەوە نەبینی، تازە تێ پەڕیت، ماوەیەکی تر هەموو کۆڵانەکە ناوی پیرێژنت لێ دەنێن. وایشە، ئەوەتا بەری چاوت کف [illegible]بوە، پێڵوەکانت شاش و نارێکن، ڕیقنەی سپی کەوتۆتە سووچی چاوتەوەو چرچە باریکەکانیش قات قات بە سەر یەکدا کەوتوون. ئەوسا کەی وا بوویت؟ لە بیرتە ئەو ڕۆژەی بۆ (نوری) گوێزرایتەوە؟ خوشکە گەورەکەت لە ناودوەیدا ئەکوڵاو ئەبرژا، تەنیا تۆ هەستت پێ ئەکرد کە خەریکە شێت ببێت، بەڵام ئەو بەسەر خۆی نەدەهێنا، دانیشتبوو، وەك مەرگی لە بەردەمدابێت چاوی هەڵنەدەهات، ئاخر لەو زەمانەی تۆدا کەی خوشکی بچووك لەپێش گەورەوە شووی کردوە! جا تۆ بڵێی چی؟ (شەمسە)ی خوشکت قەیرەو ناشیرین بوو، کەس نەی دەویست، ئەمەیش هەر چارەنووسێکی نەگریسە. بۆیە خووی دابووە شتی تر، بەناو بەختی هەموو کەسی لەبەر دەستابوو،

ببـوو به دەم ڕاست و ڕاوێـژکـاری ژنـانی گەرەك، كە لەگەڵ مێردیـانـدا تێ ئەگـیران، گرفتێكیان ئەهاتە ڕێ، خەوێكی نا جۆریان ئەبینی ئەهاتنە لای شەمە، شەمەیش سەری زمان و بنی زمانی جوێن‌ابوو بە پیاو ئەی ووت (ئەگەر خوا پیاوی خۆش بویستایە نەی ئەكردە حەماڵی ژن) یان (هەر پیاوە دنیای وێران كردوەو زیـنـدەوەری بێ لانـەو مرۆڤـی دەربـەدەرو خۆی شەرمەزاری لای خوا كردوە) ـ شەمە ـ لای ژنان فریشتە بوو، فریشتەیەكی سپیو پاك و بێگەرد، وەك هەندێك لەو ئافرەتانە لە خەوا ئەیان بینی گوایا شەمە بە دوو باڵی سپیەوە فڕیوە بۆ لای خواو سكـاڵای دامـاوەكانی پێ گەیاندوە. بەڵام تۆ لە هەموو كەس باشتر ئەناسی، لە بیرتە شەوانە بە زۆر لای خۆیەوە ئەی نواندی، لە نیوەی شەودا كە دنیا كڕ ئەبوو ئیتر ئەژنۆتی لە ناو لنگی خۆی دەناو ئەكەوتە هەڵوشین و پیا نووسانت، كە بە ئاگا ئەهاتی دەستت بەسەر مەمكە ڕووتەكانیەوە بوو، لە سەرەتاوە بەمەت نەزانی، یان هەستت پێ نەكرد، بەڵام ئەمەندە دووبارە بووەوە كە تۆیش نامۆییەكەت بە سەرا كشا، لە پێشا وات زانی لە خەودایە، هەر چیەكیش لە خەودا بكرێت باجی لەسەر نیە، وات لێ هات كە ئەو دەكەوتە خۆ پێوە نووساندن و هەناسەی گەرمی بە سەردا دەكردیت زوو بە ئاگـا دەهـاتی، ئارەقەت دەردەدا، لەشت دوور ئەخستەوە، پاشانیش زانیت ئەو ڕازە لە كوێوە سەر هەڵئـەدات، ئەو دەسـت بەردارت نەبـوو، لە دەستكەوتەكەی ژنان بەشی دەدایت، مەرایی بۆ ئەكردیت، كە ژنان لەدەوری كۆ دەبوونەوەو بە فریشتەیان ناو دەبرد تۆ چاوت دەچـووە پشتی سەرت، ووتەكانی دەبوونە دەرزیو بە لەشتا ئەچوون، تەنانەت بەرماڵ و تەزبیحە سەدوپەك دەنكە كەیشیت بە گڵاو دەزانی، ئەویش هەستی بەم بێـزاریـە سەختەی تۆ كردبوو، كە چاوت تێ دەبری وەك پشیلەی گۆشت دز ملی شۆڕ دەكردو چاوی نەوی، لە ناخیەوە پێی ئەوتی: تۆ ڕاست ئەكەیت، خوشكەكەم، ئەمانە منیان بە زۆر كردۆتە فریشتەی پەرو باڵ سپی، بە قەدەر تۆیەكی هێشتا كاڵ لە من نەگەیشتوون، واز بێنە، ئەم دەستكەوتە بۆ هەردوولامان، بۆ هەموومان چاكە. ئای ـ شەمە ـ بۆ ناهەقت بوو؟ ئەگەر سروشت ناشیرینی نەكردیتایەو وەك هەر ئافرەتێكی دی لە كاتی خۆیدا ببویتایەتە خاوەنی مێردو منداڵ، بێگومانم هەرگیز بەوە قایل نەدەبوویت ئەو پێستە لەبەر بكەیت. ئەی من بڵێم چی؟ ئەشێ دنیا ڕەنگاڵەییەكەی گەنجیم، ئارەزوە سەر كێشـەكـەم، خەونـەكـانم دەستەمۆ ببن و وەك خۆڵەمێش سارد ببنەوە؟ نەء.. دایك و باوكم بەمەیان ئەزانی، لە ڕاستیا نەیشیان دەویست ـ شەمە ـ یان لە كیس بچێت، بەڵام ـ نوری ـ زوو لەوە گەیشت كە بەرتێلێكی چەوریـان بداتیو دەست و دەمیان لە گوێبخات، سەد دیناری ئەوسا شارێكی پێ دەكڕرا، منیش ـ نوری ـ م خۆش دەویست و پێم خۆش بوو زوو لەو ماڵە ئەفسووناویە ڕزگار بم، ئای دوو ساڵی ژن و مێردی وەك خەو هاتیت و تێ پەڕیت، بۆ وازوو؟ ئەی مەرگ تۆ بۆ ئەوەندە نامەردو نهێن گربوویت؟ چۆن وازوو نەخۆشیەكی كوشندەت بۆ دۆزیەوە نەت هێشت لەچەند مانگێك زیاتری پێوەبێت! خۆزگا منیش لەگەڵ ئەودا بمردمایەو جارێكی تر ڕێگام نەكەوتایەتەوە ماڵی باوكم. بەڵام خۆ شیوەن و كۆستە لەپڕەكەی من بۆ ـ شەمە ـ بوو بە جەژن، وای ئەزانی لە شەڕێكی گەورەی مەرگ و ژیاندا سەركەتووەو شەڕەكە بە قازانجی ئەو شكاوەتەوە، لە ناوەوەیدا دەتریقایەوە، هەڵدەپەڕی، ئەمەیشی كردبووە بەشێكی تری ئەو فێـڵ و تەڵەكـەیـەی كە زیـاتـر ژنانی پێ دەخەڵەتاند، گوایا تۆڵەیەكی یەزدانیەو خوایش ئەمی خۆش دەوێت پێی دەوتن: خوا هەقی بزنی كوڵ بەسـەر شاخدارەوە ناهێڵێت. قسەكانی هەموو بە توێكڵ بوون، پلار بوون و جەرگی تۆیان هەڵدەدری، ئەو لە زەلیلی تۆدا خۆش بەخت بوو، تامی لەو باڵ شكاویەی تۆ دەبینی، ئەی تۆ چی بكەیت؟ دەستی شكاو هەر مل ئەی گرێتە خۆی، ناچار بوویت جارێكی تر لە ماڵی باوكتا بكەویتەوە زوو خاو خواردن، ئەی چی بكەیت؟ بۆ كوێ بچیت؟ بەڕاست ئەوە تۆ بۆ كوێ چوویت؟ دەی واز لەم ڕابـووردوە مردوانە بهێنە، ئەمانە گالیسكە شكاوەكەی مەرگی تۆن. دەی پەرێژن دیسان بە سەرو قژتا وەرەوە، چرچ و لۆچەكانی دەم و چاوت، مەمكە چەق و سیسـەكـەت، هەناسەی سوارت، هەنگاوی سست و ماندووت. باشە، جا كێ ناڵێ قسەی ـ شەمە ـ ڕاست نەبوو، ئەی بۆ وات لێ هات؟ ئارەزوەكانی ئەو نەهاتنەدێ، كەس نەی زانی حەز لەچی دەكات و بۆچی دەسووتێ؟

بەڵام تام نەكـردن چاكـترە لە یەكجار چەشتن، تامێكی هەیە خۆش بەر زمانت بكەوێت و ئیتر پێی نەگەیتەوە. خۆ شەوەكانی تۆیش بوو بە شەوە ساردەكانی شەمەی خوشكت، ئەزانیت نەء

لەتۆ باشتر بوو، زۆر جار تا نیوە شەوێکی درەنگ لە ناو جێگادا هەر دەتلایتەوە، لەشت مێروولەی دەکرد، ئەبووە لاشەیەکی کرم تێ کەو توو، تەپاو تلت دەکردو خۆت هەڵدەوشی، بەیانیان کە هەڵدەستایت ناو چاوت سوور بوون، نە رۆژێک و نەدوان، هەموو جارێکیش دایکت پێی دەوتی: کچم تۆ بەشەو نانوویت، ئەو چاوە خوێن تێ زاوانەت هی نەخەوتنە. کە دوای سێ ساڵ بێوەژنی جارێکی تر هاتنە خوازبێنیت - شەمە - گری گرت، کردیە بەزمێک کە نەکراوە، هەر ئەوە نەبوو کۆڵانەکە بەسەر خوازبێنی کەرەکاندا نەخرۆشێنێت، دەمیان راوە رێوی لەبەردەم گرێ کراوەکەی بەختت دانا، چارە نووسێکی پێ رەوادیت کە ئێستا تۆی بێرە گەیاند، دایك و باوکیشت وایان لێ هاتبوو ئەگەر - شەمە بیوتایە ماست رەشە ئەیان ووت وایە، بە خوازبێنی کەرانیان ووت: (کچەکەمان پێی رەشە، بەد بەختە، شوو بە هەرکەسێك بکات وەك گەڵای پاییز ئەی وەرێنێت، ئەگینا - نوری - دارێك بوو بەتەور نەدەبرایەوە، ئەی بۆ ماڵەکەی کوێر کردەوە!).

تۆ هیچت نەوت، ئەبوو هەر نەیشی لێیت، زانیت - شەمە - ی خۆشکت هەقی بەرو دوای لێ کردوویتەوە، وەك مار گەمارۆی داویت و ناهێڵێت لە خۆی چاکتر بیت، ئەبێت چاو لە دەستی ئەوو هاودەمی شەوە مردوەکانی ژیانی بیت.

خۆت گرت، لە راستیا لەوەیش ترسایت نەوەکوو قسەکەی راست بێت و مۆری ئەو بەدیەت بەناو چاوەوە بنرێ، کێ چووزانێت، بە سەر ئەو کەف و کوڵیەی گەنجیتەوە کر کەوتیت، کچێك لە تەمەنی بیست ساڵیدا بێت و تامی ژنیەتی کردبێت و وای لێ بێت! زەحمەتە، زەحمەتێکی گەورە. تۆ ئێستا ئەو کاتەی خۆتت لە یادە، لەشت ئارەزوویەکی رووت بوو، کە کورێکت ئەبینی ئەتوایتەوە، ئەکەوتیتە خەون و خەیاڵاتەوە، بەسەر زەویەوە نەدەمایت، وەك سەرخۆش لەشت خاو دەبووەو دەکەوتیت، ئاگات لە خۆ نەدەما، هیچ سڵت لەوەیش نەدەکرد کە سووسەی دایك و باوکت بکەیت و بزانیت کەی پێك دەگەن، بە سەعات بەرانبەر وێنەکەی - نوری - رادەوستایت، دەست و پەنجەی، لێوی، چەناگێ، بازووی، سمێڵی، سنگی هەموو ئەبوونە باران و بە سەر کێڵگە تینوەکەی ئارەزووتدا دا ئەبارین، ئەبارین و تۆیش سنگ و بەرۆکت، هەموو لەشت رووت دەکردو ئەت مژی، تێر ئاو ئەبوویت، بەڵام تێر بوونێکی شێتی، خۆ بە دەستەوەدانی شتێکی نادیارو ناچاری. هەموو ئەمانەت دەزانیو نەت دەتوانی لغاو لە دەمی ئارەزوەکانت بنێیت. کە دوای بیست ساڵیش هەر سێکیان یەك بەدوای یەکدا سەریان نایەوە، تازە تۆ کەڵکی شووت نەما بوو، ئەوان تا دوا دڵۆپی تۆیان نە خواردەوە دەست بەردارت نەبوون، تۆیەکی تەنیا، بێ کەس، وەك هەر ئاوارەیەك ژیایت، کاری باوکت راست بێت ئەو کونجە خانووەی بۆ بەجێ هێشتیت، ئەو دووژوورە گڵەی کە پاشان فرۆشتت و ئێستایش لەم ژوورە کرێیەدا دەژی، پارەی ئەو خانووە نەبوایە ئەکەوتیتە کۆڵان و بەرماڵی خەڵکی، هەر باشە، ئێستایش.. ئا.. بەراست ئەمە چەند جارەتە سەربکێشیتەوە ناو دالانی ئەو یادگارانە؟ سەد.. هەزار خوا ئەزانێت، هەمووی لە لایەك و قسەی ئەو کورە گەنجە لە لایەك ئەگەر ئەو نەبوایە تۆ لە بەردەم ئەم ئاوێنەیەدا نەدەبوویتە پەیکەر، کەی وات لێ هاتووە پێت بڵێن پیرێژن؟ ئەی چۆن و لە کوێوە هێنای؟ راست دەکات، تا ئێستا ئەو تاڵە مووە تۆی هێشتبووەوە، جار جارە یارێکت دەکرد، لەشت مووچرکێکی ساردو هێوری پیا دەگەرا، ئیتر تەواو، هەر عەیبیشە پیرێژن بیر لەوانە بکاتەوە، شەرمە، خەجاڵەتیە، ئەو کورە راست گۆ بوو، وەك ئەم ئاوێنەیە شتە راستەقینەکانی پیشاندایت، ئەوە سەرە سپیەکەت، ئەوە دەستی چرچ و ناو لەپی زبرت، ئاوێنەکە درۆ ناکات، ئەمە ئاوێنەی راستیە، تەمەنت دەردەخات و ناتوانیت لە بەردەمیا خۆت بشاریتەوە، تەماشای بکە، زیاتر، چاکتر، ئەوە خزایت؟ بەرەو خوار، بەرەو خوارتر، پێویستە وەك تەمەنت لە ئەویدا بژیت، تا ئەو هەڵکشێ لەشی تۆ زیاتر بەرەو خوار ئەخزێ. دەی پیرێژن، هاتیت، کەوتیتە سەر زەوی، دەستیشت بە دامێنی ئاوێنەکەوەیەو ناتوانیت وازی لێ بهێنیت، خۆت بگرە، هەناسەیەکی قووڵ، ئەوە بەر چاوت رەش بوو، ئاوێنە باڵانماکەیش لە دیوارەکە بوومەو بە دەستتەوە هات، کەوت، شکا، وردو خاش بوو، پارچەکانی هەموو ئەم لاو ئەولاتی گرتەوە، پارچە وردو درشتەکان، تۆ لە ناوەراستیاندایت، دەست بخەرە سەریان، پەنجەیان تێ وەردە، با بریندارت بکەن، دەی دەستیان تیا رادە.. دەست، دەی پیـ .. رێ پ ی ر ێ ژ ن

حوزەیرانی ١٩٩٠

# یادە زیندووەکان



فەرهاد محەمەد قادر

هەر کە دەگەیتە سەری کۆڵانەکە، هەنگاوەکانت سست دەبنەوە.. لە جێگای خۆت دەچەقیت.. وا هەست دەکەیت قاچەکانت بە زەوی‌دا داکوتراون و لەشوێنی خۆیان نابزوون.. هەوڵ دەدەیت بەدوای خۆت دا بەکێشیان کەیت، بێ مروەتانە لێت یاخی دەبن و هێزوتوانات خاو دەکەنەوە.. بەرەو لای ڕاست وەردەچەرخێیت.. سەر هەڵدەبڕی، هەمان کۆڵانی پیس و قوڕو لیتاوی باوەشت بۆ دەکاتەوە.. تەکان دەدەیت و دەتەوێ چەند هەنگاوێك باوێیت، ناتوانیت.. لەسەری کۆڵانەکەوە لێت دیارە.. نیمچە گۆرانێکی بەسەردا هاتووە.. بەلای دەستە چەپ دا سێیەم دەرگا.. چ دیمەنێکی جەرگبرە.. چ یادێکی تاڵ و خوێن مژە.. بەلای دەستە چەپ دا سێیەم دەرگا.. بەلاتەوە نامۆنی‌یە.. شارەزایت.. گەلێ جاران ڕووت تێکردووە.. قەت لە بیرت ناچێتەوە کە سەردەمانێك ئەو دەرگای سێیەمە قیبلەی مان نەمانت بووە.. دێوی بێ کەس‌و نامۆیی‌و خەم و تەنیایی تۆقاندووی.. ئێستاش بە سەدان ڕازو نیازو چرپەو ماچ و مووچی لە کون و کەلەبەرە هەرە تاریکەکانا شاردوّتەوە..

ڕازو نیازی سەردەمانێکی پڕ خەون و ئارەزوو و ئاوات.. ئارەزوو و ئاواتی کیژۆڵەیێکی لەرو لاوازو وەرەمەدار.. فرێ دراوی بەرپێی ڕۆژگارێکی بێ مروەت.. زەمانێکی دڵرەق و بێ ئەزاکەت.. ئێستاش بۆنی ژوان و چرپەو هەناسەی لێ دێ.. کۆڵان سەرتاپا بۆنی ژوانی گرتووە.. لووت و گوێچکەو سێیەکانت پڕ دەبن.. لێرەدا دڵت بەتوندی دەکەوێتە لێدان.. ئەرمانی گوێت سوور هەڵدەگەڕێن و، گەرم دادێن.. چ شتێك لەو دونیایەدا نی‌یە وات لێبکات دان بەوەدا بنێت کەچرپەکان جارێکی تر دووبارە نابنەوە.. تەنانەت مردنیش ناتوانێت چرپەکان دەم کوت بکات، لەگەڵ ئەوەش دڵنیایت کەخەونێکی کورت بوو، چۆن لەناکاو هات، هەر ئاواش لە ناکاو تێپەڕی.

خۆت گورج دەکەیتەوە.. هەموو هێزو توانات کۆ دەکەیتەوەو بەرەو دەرگاکە دەکشێیت.. لەپڕ دەکەوی‌یە ناو بەرداشی دوو دڵی.. دوو دڵی لەچوون بۆ ئەوێ‌و، گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووی.. وەکو جاری یەکەمت دوو دڵ دەبیت.. جاری یەکەم دوو دڵی شەرم بوو.. کەچی ئێستا دوو دڵی فرمێسك و گریانە.. بچیت بۆ لای کێ؟! هەر لەگەڵ چوون و بەژوور کەوتنیشت برینی چەند کەسانێك دەکولێنیتەوە.. لەگەڵ چەند کەسانێکی جەرگ براوو پشت شکاو نقوومی دەریایێك فرمێسك و لالانەوە دەبن.. لەپڕ دیمەنێکی شیرین تەمی دوو دڵیەکەت دەرەوێنێتەوە.. چەند هەنگاوێکی خاوو شل بەکێشت دەکەن.. ڕەنگ پەڕیوو هەناسە سوار.. لەوکاتەدا هەر لەوانە دەچێت کەمەرگی خۆیان بەدەم هەڵدەگرن و بەرەو مردن دەڕۆن.. کۆڵانەکەکش‌و مات دیارە.. بەر دەرگای سێیەمیش کش و ماتتر.. کە دەگەیتە بەردەمی دەرگاکە دەبیت بەبتێك و لەشوێنی خۆت دەچەقیت.. سەرنجێکی ووردی هەرچوار لای خۆت دەدەیت.. ساڵێك زیاترە ڕووت تێنەکردووە.. لە هەوەڵا بە پەلە بووی بۆ هاتن.. خۆشت نەتدەزانی بۆچی کێچی ئەو هاتنە کەوتۆتە کەوڵت.. بۆ سەلماندنی وەفای ئافرەتێکی وەرەمەدار، یا بۆ هەست کردن بەچەند بیرەوەری‌یەکی ڕەنگ زەردو مردوو.. دوای دووجار دەریای فرمێسکی بێ کۆتایی ڕێگایان پێ وون کردی.. خەمیان سەختتر کردی.. بۆیە بڕیارت دا نەیەیت.. کەچی ئەوەتا ساڵێك زیا ترە ئەو بڕیارە سەخت و دژوارە تەنگی پێ هەڵچنیویت.. بێ مروەتانە هەراسانت دەکات.. تا ئەمڕۆ بە ناکامی چۆکت داداو، ڕێگای ساڵانی ڕابردووت دایەوەبەر.. هەمان ڕێگاو، هەمان کووچەو کۆڵان.. لەیادتە، کەجاری یەکەم

هاتی «ئامە»ت لەگەڵ بوو.. ئەو یەکەمجار تەوقی ترس و شەرمی لەبەرت دامالْی.. لەو ساتەدا هەست بە بوونی ئەویش دەکەیت.. کە بۆ تەنیشتی خۆت دەڕوانی لە سێبەرەکەی خۆت بەولاوە هیچی تر نابینیت.. «ئای ئامە گیان! خۆزگە منیش لەگەڵ تۆدا ئەو دنیایەم جێ هێشتبایە.. تۆ پێی چوویت و منیش دووبارە کەوتمەوە بەر شەقی ئەو ڕۆژگارە نامەردە.. وەرەم زۆر دڵڕەقانەو لەکاتێکی زۆر ناسك و ناوەخت ڕای ڕفاندی.. دوای حەوت ساڵ مل ملانێ و بەرگری، دوایی هەر ئەو گرەوەکەی بردەوە.. ئەو کاتانەی قێزت لەم ژیانە دەبۆوە گەلێ جاران مەرگت بەزاند.. حەزت دەکرد خۆت لەم زۆرانبازی‌یەدا بدۆڕێنیت، بەلام بەدەست خۆت نەبوو.. کەچی کاتێ پڕ بەدڵ حەزت دەکرد بژیت.. بەم ژیانە کامەران بوویت، مەرگ لەناو باوەشی سێیەم مانگی خەلوەتدا ڕایپێچای.. خەلوەتی دووەم.. دوای ڕابوردنی چوار ساڵ بەسەر یەکەم خەلوەتی کچێنی».

یەکێك بەوێدا ڕابورد.. بەچاوێکی پڕ گومانەوە سەرنجی دایت.. لەوە دەچوو بتناسێت، یا پێشتر لێرەی بینیبیت.. تۆزێك شڵەژایت.. بۆڵەیێکت لێوە هات و بە ئەسپایی دەستت بۆ زەنگەکە بەرزکردەوە.. کابراش بە لۆژە لۆژ ڕێگای خۆی گرتە بەر.. جاران زەنگی پێوە نەبوو.. لە بیرتە هەر جارەی دەهاتی زۆر بە شەرمەوە لەدەرگات دەدا.. لەگەڵ هەر لە دەرگا دانێکا واتدەزانی بزمارێك دادەکوتنە کاژەڵەی سەرت.. ئێستا ئەو کارەشت بۆ ئاسان بووە.. هەر ئەوەندە دەستت دەنێیت بە زەنگەکەوە، دەرگات لەڕوودا والادەبێتەوە.. هەموو شتێ لەم گەردوونەدا ڕوو لە گۆڕانە.. یا تازەبوونەوە، یا کۆن بوون و کۆنترو لەناوچوون.. خۆت چاك هەست بەوە دەکەیت کە کۆن بوویت.. ئیتر کۆنترو دوای ماوەیێکیش بەرەو هەڵدێری لەناو چوون خل دەبیتەوە.. سنگە ڕەق و تەق و مەمکە چرچ بووەکانت شایەتی ئەو کۆن بوونەت دەدەن.. ئەوەتا ئەو جووتە مەمکە توندو تۆڵەی سەردەمانێك بەسەر سنگتدا قنج وەستابوون و، لەدوو هەناری کاڵی نەگەییو دەچوون، لەژێر کراسدا لەگەڵ ڕۆیشتندا بە نەرمی دەلەرینەوەو هەر ئەوەتا کراسەکەتیان دانەدەدراند ، ئێستا هەر لە دوو جرجی تۆپیو دەچن کە بەسەر سنگتدا داکوترابن.. ئەوەندە لەڕو لاوازیت، لەژێر پێستی پشتە دەست و پێ‌و، پووزە زەردەکانتدا چەند ڕیزێك دەماری شین دەرپەڕقیون.. هێندە پیس و بێزەلەتن، سەگیش قێزیان لێ دەکاتەوە.. کەمناڵیش بوویت هەر ئاوا مایەی قێزو ڕشانەوە بوویت.. چاکت لەبیرە.. ئای ڕۆژانی منالْی کە هەرگیز لەبیر ناکرێن.. جیهانێکە بێ تاوان.. خەوێکە بێ کۆتایی.. تاقە خوشکی حەوت برا.. چواریان لەتۆ گەورەترو، سیانیشیان بچووکتر.. ڕۆژ تا ئێوارە دەیانڕەتاندیت.. ڕۆژ تا ئێوارە وەستانت نەبوو.. بچووکەکانت بەخێو دەکرد.. کە دەگریان لە باوەشتدا ژیرت دەکردنەوە.. جار جارەش بەچەپەڵۆك لەناو قوڕو لیتەی کۆڵان و تۆزو خۆڵ دەرتدەهێنان.. بە دامێنی کراسەکەت چڵم و لیك و فرمێسکت دەسڕینەوە.. ئەوەندە گێل و وێل بوویت، هیچ شەرمت لەپیسی‌و پۆخڵی خۆت نەدەکردەوە.. سەرو تیتك بژو تێك ئالاو.. هەمیشە قامکە باریکەکانت تێوەردەدان و ئەوەندەی تر لوول و بژت دەکردنەوە.. بەشیشت هەر تێهەڵدان بوو.. هەر ئەوەندە پرسیارێکت لێدەکرا، بەر لە وەلام شەق و پێلەقە دادەباری‌یە سەرت.. تۆش دەستێکت لەناو سەرو تیتك و بە دەستەکەی ترت چڵم و لیك فرمێسکت دەسڕی‌و هەڵدەلووشی‌و بێ پەرواش دەتزریکاند.. گێژی‌و حۆلیت لە دایکت بۆ مابۆوە.. ئەو ڕۆژ تا ئێوارە وەکو مەری گێژ دەخولایەوە.. گەر لەبەرگێلاتی بێ، یا دڵڕەقی، تۆ تا ئێستاش هەستت بە سۆزی دایکایەتی ئەم نەکردووە.. سەرەرای ئەوەیش هەر جارەی بەسەریدا دەنەراندن، حەوت گەرەکی بە ئاگا دەهێنا.. تۆ گەلێ جاران وەکو ئافرەتێکی بێ دەسەلات بە تەنیا بێ دەنگ بۆی گریاویت.. یادت کردووە.. ئەوەتا ئێستاش سەر گۆنا چرچەکانت مێروولە دەکەن.. دوو ڕێز فرمێسکی ڕوون کارێزی چاوەکانت دەتەقێنن.. هێزی خۆشەویستی دایکە کلۆڵەکەت جەمسەری بیرکردنەوەت دەپچڕێنێ.. با ئەویش هەست بەو سۆزو خۆشەویستی‌یە نەکات، تۆ هەستی پێ دەکەیت.. هەر خۆشت دەوێ.. هەست دەکەیت تۆ خۆت مەخلووقێکی تریت و ناچیتە ناو دنیا خەساوەکەی ئەوان.. باوکە دڵڕەقەکەت، لەوەتەی بەبیرت دێ چ ڕۆژێ هەستی نەکردووە ئێوە منالْی ئەون.. هەر ئامادە بووە هەر کامێکتان بە چەند دینارێك بگۆڕێتەوە.. گەلێ دیمەن هەن کە هەتا هەتایە لەیاد ناچن.. دیمەنی زریکەو لێدان و هات وهاوار.. شەو مانەوەی کۆڵان و پەنا دیواران.. لێرەدا هەست دەکەیت

فرمێسکەکانت لەسەر گۆناکانت دەمەیێن و، رقێکی قووڵ دڵ و دەروونت دەتەنێ.. هەست دەکەیت وەستانت بەم شێوەیە لەبەر دەرگای ئەو ماڵە جێگای گومانە.. هەرکێ بەوێدا تێدەپەرێت بە ووردی سەرنجت دەدات.. دەستت دەخەیتە سەر زەنگەکە، کەچی پەنجەکانت شل دەبن و هێزیان تێدا نامێنێ.. قاچەکانت دەلەرزن و توانای هەڵگرتنیان نامێنێ.. سەرت دەنێی بە دەرگاکەوەو، پێڵووەکانت دەکەونە سەر یەکتری......

ئێوارەیەکی نیسانە.. «ئامە» گەلێ دڵخۆشە.. بەو خۆشەویستییەیە بێ هوودەیە گەلێ شادمانە.. ماوەیەکە سەرکۆنەی کردوویت.. سەری زمان و بنی زمانی هەر «مورادە».. باس هەر باسی رازو نیازو ماچ و مووچی ناو دالان و پەنا دیوارو سووچە تاریکەکانە.. ئەوان گەلێ بەو جۆرە ژیانەی ئێستایان رازین.. دوو مرۆڤی لەرو لاوازو وەرەمدار.. هیوای چاک بوونەوە بۆتە هیوای دووەم.. ئومێدی یەکەم هەر ئەو تاقە خۆشەویستییەو، هەناسەی گەرمی میکرۆباوییە.. لەیەک خشانی دەندە رەقوتەقەکانە.. لە یەک چەقینی مووی بژی سنگێکی تووکنی نەخۆش و، جووتێ مەمکی پووکاوەیە.. نقوومی خەوو خەیاڵێکی بێ بنن.. «ئامە» ماوەیەکە لەهاتن و چوونی ناو بازارو دیدەنیدا جلی رەشی بێوەژنێتی فڕێداوە.. لەوەتەی لەگەڵ «مورادە»دا خەریکی رازو نیازو گۆڕینەوەن، لەناو نەخۆش و فەراش و سستەرەکانیش بووەتە چپە چپ.. کەچی ئەوان زۆر بێ باکن و دەربەست نین.. «ئامە» هەر رۆژەی کراسێك لەبەر دەکات.. قژی خۆیشی بڕیوە، بەوە منالتر دیارەو رۆحیشی سووکتر بووە.. جانتاکەشی پڕ بووە لە شانەو نەینۆك و مووکێش و قەڵەمی چاوو برۆو کشتەك و گەلێ شتی سەیر تریش.. هەقێتی.. سەرەرای وەرەم چواو ساڵە تێنوویشە.. خۆتێنوێتی ئەوانەی لەو ئاوی کەوسەرەیان خواردوتەوە گەلێ لەهی ئەوانە سەختترە کەهێشتا تامیان نەکردووە.. جاحێڵەو، تێنوێتی بێوەژنێکی جاحێڵیش بە ئاسانی ناشکێ.. دەترسێ رۆژێ بە عەزرەتی قومێ ئاوەوە سەربنێتەوە.. وەرەمەو ئامانی نییە شنەی بای فێنك بۆنیگوڵ وگژو گیای دەشتەش زیاتر هەست دەبزوێنن.. نەخۆشیو تەنیاییو شوێنێکی چۆڵ و هۆڵیش، مرۆڤ فێری گەلێ شت دەکەن.. تۆشیان فێری گەلێ شت کرد.. گەلێ شتی وون.. گەلێ شتی بێ ناو.. بێکەسیو بێبەری بوون فێریان کردی چۆن بژیت.. وایان لێکردی زیاتر بەژیانەوە پەیوەست بیت.. ژیانیان لاخۆشەویستتر کردی.. دێتەوە یادت ئەو هەڵوێستانەی لە دەروونتا بوونە رقێکی پیرۆزو رۆژ لە دوای رۆژ تەشەنەیان کرد.. کە دوو سێ جار چوویتەوە، ترسێکی گەورەت لە چاویان خوێندەوە.. ترسی تووشبوون.. ترسی مردن.. جاری دووەم هەموو شتێ جیا کرابۆوە.. هەر لە پیاڵەو قاپ و قاچاغ و کەوچك و جامی ئاوەوە، تا دەگاتە لێفەو سەرین و سابوون و لیفکەو...... هتد.. .

چوار پێنج مەتر لێتەوە دوور دادەنیشتن.. کە دەتدواندن روویان لێت وەردەگێڕا، نەوەك هەناسەت هەڵژن.. کە خوێن دەرشایتەوە، بەدزیو بە ئاشکرا تف بارانیان دەکردیت.. بە ئاشکرا گوێت لێبوو دەیانووت: «ئەو سیلدارە بەرۆکمان بەرنادات».. هەستت کرد نامۆیی هەموو گیانت دەتەنێ.. بەرەبەرە بێبەری بوون لەچاویان بڵێسەی دەدا.. هەر لەباوکتەوە تا دەگاتە بچووکترینی براکانت.. ئەوانەی جاران رۆژ تا ئێوارە بە باوەشتەوە چڵم و لیك و پیسیت بە دامێنی کراسەکەت دەسڕین.. بەمە یەکەم دەماری گێلیان قرتاندیت.. گریان و هەنسك و سۆزی خێزانێکی گەرم و گوڕیش زیاتر بە ژیانیان ناساندیت.. بۆ یەکەمجار فێریان کردیت پێویستە چۆن بژیت.. چۆن بیر بکەیتەوە.. چۆن لەوانە بێ بەری بیت کەلێت بێ بەرین..

چۆن بە رووی ئەوانەشدا هەلشاخێیت ئەوانەشت خۆش بوێت کە پاك و میهرەبانن

ئێوارەیێکی نیسانە.. «ئامە» گەلێ دڵخۆشە.. بە بەیانییەوە باسی دیمەنی ئەودیوی باخچەی ئەمشەوت بۆ دەکات.. چیان ووت.. چیان کرد.. چەند ماچی گەرم.. چەند هەناسەی سارد.. بەلام تۆ، چەقۆیەکی تیژ هەناوت دەکێڵێ.. ژن و پیاوو منال دارژاونەتە ناو باخچەکە.. کۆمەڵ کۆمەڵ بەدەم شت قرتاندن و گفت و گۆوە ـەتریقێنەوە .. گەلێ دڵخۆش و بەختەوەر دێنە بەرچاو.. ئەمرۆ یەکەم رۆژی دیدەنی ئەم هەفتەیەیە.. ساغەکان برینی نەخۆشەکان سارێژ دەکەن.. گەلێکیش بەکزییەوە چاوەرێن.. بە مەلوولیو کەساسی، وەکو خۆت بێ هوودە چاویان بڕیوەتە دەرگا.. «ئامە»ش چاوەرێیە.. چاوەرێی ماڵە خەزوورانە.. پیرە دایکەکەی نەبێ دەنا جگە لە

ماڵە خەزوورانی کەسێکی ترت نەبینیوە بێتە دیدەنیی.. ماڵە خەزوورانی تا ئێستاش دان بە بێوەژنێتی «ئامە»دا نانێن هەر چاوەڕێن.. چاوەڕێن شنەی دیدەنییەکی دووری چوار ساڵە لە کێوەکانەوە هەڵکات و تەمی دەم ئاسۆی درۆو دەلەسەکان بڕەوێنێتەوە.. دێوی ئەو حەزە پاکەی «ئامە»و «موراد» ڕاوبنێ.. لەگەڵ «ئامە»دا لاچەپێکتان گرتووە.. لێت دیارە «موراد» لەگەڵ کۆمەڵێ ژن و پیاوو منداڵ بەرامبەر «ئامە» دانیشتووە.. بەدەم لەگەڵ ئەمان دەدوێ‌و بە چاویش لەگەڵ «ئامە».. بۆنی گوڵ و گژو گیاو شنەی ئەو ئێوارەیە کاسی کردوویت.. دەنگی ماشێن و کارگەو زاق و زووقی منداڵەکان کز دێتە گوێت.. «ئامە» بەچاوو دڵ لەم جیهانە پڕ ژاوە ژاوەدا چۆتە دەرەوە، لەگەڵ «موراد»دا بەرەو ئاسمـــان و بۆ سەر شانی هەورەکـان هەڵدەفـڕن.. تۆ کەسێك نی‌یە چاوەڕێی بکەیت.. تۆزێ باری ئەو خەم و ژانەت سووك بکـات.. سەر هەڵدەبـڕیت.. بەرەو باکـوور.. ئەودیوی تەلبەندی نەخۆشخانە.. دەشتێکی پان و بەرین .. تا لەمەودای ڕوانینت دەچێتە دەرەوە، هەر سەوزایی‌یە.. لەملاو لەولا چەند گوندێك لە ناو سەوزایی‌دا بۆر دەچنەوە.. چەند ڕانە مەڕێك بە دامێنی کێوەکانەوە ئەوەندەی مێروولە لێتەوە دیارن.. نیگاکانت بەرز دەکـەیتـەوە بۆ لووتکەی کێوەکان.. دواییش ئاسمانێکی ساف و بێگەرد.. چ دیمەنێکی هەست بزوێن و دڵگیرە.. هێدی

هێـدی بەرەو دوا.. تا نیگـاکـانت و ڕوخساری ئامە یەکانگیر دەبن.. دەبینێت زەردەخـەنـەیێکی ناسـك لێـوە سیسـەکانی دەبـزوێنی.. کە سەر هەڵدەبـڕەیت یەکێـك بەزەردەخــەنـەوە بەرەو ڕووتــان دێ کە دەگـاتـە ئاستتـان «ئـامـە بەرێـزەوە لەبـەری هەڵدەستێ‌و، بەڕوو خۆشی‌یـەوە دەست دەنێنـە ناو دەستی یەکتری.. ئای کە یەکەم دیمەن پڕ کارەسات و شتی شاراوەیە.. یەکێکە لە دیمەنە لەیاد نەچووەکانی ژیان.. دەشێ گەلێ دیمەن و لەزەتی ماچ و هەناسەو هەڵگلۆفتن و گوشین و گەلێ شتی تریش لەیاد بکرێن.. بەڵام ئەو دیمەن و هەڵوێستانە هەتا هەتایە هەر تابلۆیەکی زیندوون.. هەر سەرەتای ژیانێکی ترن.. خەمێکی ترن.. تۆ ئەو کاتــەت هەر لەبـەرچـاوە کە بە شەرمەوە سەرت داخست.. فێری ئەو مەدەنیەتە نەبیویت.. ئەو بە زەردەخەنەیێکی شیرینەوە دەستی بۆت درێژ کرد.. تۆ وەکو ئێستـات دوو دڵ بوویت.. فێر نەببـویت دەستت بخەیتە ناو دەستی پیـاوێکی نەدیت و نەنـاسیـاو.. نەتـدەزانی ڕۆژانی داهاتوو گەلێ شتی نەزانراوت فێر دەکەن.. بەو شتانەت ئاشنا دەکەن کە لێیان دەترسی‌و، سڵیان لێ دەکەیتەوە.. کاتێ دەستە لاوازەکـانت خستـە ناو لەپـە زبـرەکـانی، تەزوویەکی گەرم بەسەرتاپای لەشتدا کەوتە مێروولە کردن.. ڕوومەتەکانت سوور هەڵگـەڕان.. کەوتیتە هەڵوێستێکی نارەحەت.. ویستت بەهەر شێـوەیێك بێت خۆت ڕزگار بکەیت.. ئەو نەیهێشت.. لەگەڵت کەوتە دوان.. بەرەبەرە گڕێ کوێرەکانی دەروونت پچڕێنران.. هەستت کرد تۆش لەگەڵ «ئامە»و «موراد»دا دەچیتە سەر باڵی فریشتەکان و، بەرەو ئاسمان و سەر شانی هەورەکان دەفڕن.. پڕ بە گەرووت هاوار دەکـەیت: «جێم مەهێڵن.. لەگەڵ خۆتانا بمبەن.. ژیان لەسەر ئەم زەمینەدا گەلێ سەختە.. گەلێ دژوارو پڕ گێرمـەو کێشەیە.. بمبەن بۆ ئاسمانە دوورەکان.. بۆ سەر شانی دوورتـرین پەڵە هەور.. مردن لەسەر شانی هەورەکان گەلێ شیرینتـرە لەژیـانی ناو زبڵخـانـەی ئەو زەمینە پیس و بۆگـەنە!» تۆ تا ئەو کاتەش گاڵتەت بەو جۆرە شتانە دەهات.. بڕوات بەو قســە پڕو پووچــانــە نەبــوو.. پیـاو بەلای تۆوە جانـــەوەرێکی زەبـــەلاح بوو.. باوکت بوو.. براکــانت بوون.. نەفـرەتی ئەو دنیـایەت لێ دەکردن.. پیس و بەدو بەد فەساڵ دەهاتنە بەرچاوت.. کەچی لەپڕ ئەو دیوارە ڕووخاو، لەودیوەوە ڕووە پاکـەکـەی پیـاوو مرۆڤ و ژیان دەرکەوت.. بیرو باوەڕە پووچەڵەکانت زۆر بە ئاسانی لەکاتێکی زۆر کورت دا هەرەسیان هێنا.. وورده وورده درزیان تێکەوت و، داتەپین.. ووشەکانی ئەوەندە نەرم بە پەردەی گوێکانت دەکەوتن ختووکەیان دەدایت. زەردەی ئێوارە لە ئاسۆوە دیمەنێکی خوێناوی بوو.. لەگۆمێکی خوێنی مەییو دەچوو.. کە لەگەڵ سەوزایی دەرو دەشتدا تێکەڵ دەبـوون، وەنـەوشەیی هەڵدەگەڕا.. چاوەکانی لە ژێر زەبری زەردەی ئێوارەدا زەردتر دیار بوون.. هەستت کرد ووشەکان تا دێن قورستر دێنە سەر زمانت..

.. لێوەکانت لەگەڵ زەردەخەنەی پڕ شەرمـــدا دەلەرزن.. ڕوومـەتـەکـانت تادێ گەرم دادێن و، خوێنیش توندتر بە دەمارەکانتدا دەگەڕێت.

ئەم ئێوارەیە یەکەم هەنگاو بوو لە سەرەتای ڕێگایەکی هەڵەت و

ئەمو دوورو درێژ یەکەم خشتتان نایە سەر دیواری حەزێکی
-لا.. ئەو شەوە خەو نەچووە چاوت.. تا بەیانی بەسەر
قەرەوێڵەکەتەوە هەر تلاو تلت بوو.. هەستت بە زۆر شت
-مکردو، هیچیشت لێ نەدەزانین.. هەستت دەکرد کامەرانیت..
-مەوێ بفڕیت بۆ سەر شانی هەورەکان.. بۆ ئاسمانە
-وورەکان.. هەموو شتێکت لا جوان بوو. هەموو شتێکت
خۆشدەویست.. هەرگیز هەستت بەم کامەرانی‌یە نەکردبوو، نە
-مساتە خەیاڵاوی‌یەکانی تەنیاییت و نە لە ساتە کەمەکانی
تەمەنی منالی ناو باوەشی دایکە گێلۆکەکەت.. لە بەرچی؟!
نەتدەزانی.

ڕۆژان هاتن و، ڕۆژان ڕۆیشتن.. گەلێ ئێوارەی تری ئاوا
دووبارە بوونەوە.. گەلێ ژووری تاریك و نووتەکیش ڕازو نیازی
بە چرپەو، ماچی گەرمی ئاشقانەی حەشاردان.. گەلێ جاران بە
تەنیا لەم دەرگای سێیەمەت داوە.. لە ژوورەوەی ئەم دەرگای
سێیەمە یەك پیاڵەو یەك قاپ و قاچاغ و یەك کەوچك و یەك......
هتد بوو..

هەناسە گەرمم و میکرۆباوی‌یەکانت وەك شنەیێکی فێنك
هەڵدەمژران.. کەچی لەپڕ لەسەر شانی هەورەکان دابەزێنرانە
خوارەوە.. وەك چۆن «ئامە» لەناو باوەشی خەلوەتی سێ مانگەی
«موراد»دا ڕاپێچرا، هەر ئاواش گوللەیێکی وێڵ لە بەرەکانی
شەڕدا دوا ترووسکەی چرای ژیانی ئەوی کوژاندەوە.. تۆش
لەو ڕۆژەوە نەفڕیتەوە بۆ سەرشانی هەورەکان..

که سەرت هەڵبڕی کۆمەڵێ خەڵك بە دەورتدا گرد
ببوونەوە.. بەحەپەساوی بە دیارتەوە وەستابوون.. پەشۆکایت..
بزەیێکی تاڵت کەوتە سەر لێوو، دەستت بۆ زەنگەکە بەرز
کردەوە.. پەنجەت خستە سەر زەنگەکە.. بەڵام پەنجەکانت شل
بوون و، بەسەر زەنگەکەدا ووشك بوونەوە.

هەولێر ١٩٨٩



# ئەزو توو پیژانێت خەما

● بدل رڤو ●

تەمبورو دەنگ و ژاری
ل بازارێت بەرزە بونێ
و لسەر دەرازینکێت
چەرخێ بیست و ئێکێ
ئاخینکا رادهێلن....
لسەر پیلێت دەریایێ
لسەر بابورێت ئەسمانی...
و دگەل دەنگ قەدانا خروسکێ
چیایی
لدور پێژانێت گوری کرنێ
خوین رژیا... جەرگ دریا
وتەڤ لێبوکێت جیهانێ
د تاریا شەڤێدا...
بونە صەییت مری.......
بەری دەنگ ڤەدەت سترانا
چیایێ....

ئەزو تو ...
لسەر بسیکێت چیا
سەرێ خوە بومە شوردکر
کلاڤێژا سبێدەیا.....
جاڤێت ردش و کلدای
درویشە بەرپەرێت ژینا مەنە....
ئەزو توو پەلاتینك و مان
خولیا کوچکا دی کەینە ئاگر
چاڤێت دەیکێت شەهیدا...
دارستانێت دار بەریانە
گونێت ئەڤینا من و تەنە
دلبەر.. چرا.. گولستان
سترانێت گەلێ مەنە

# لەسەر: سەری بەردی

علی فتاح دزەیی

«لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٦ تا تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٧. کارگێری ناوچەی (برادۆست) بووم لە (سیدەکان)، ئەو وەختە. ڕێگای ئوتومبیل نەبوو. بەسواری. لە (دیانە)وەو بەرێگای (شیوی شێخان) و (سەری بەردی) بۆ سیدەکان هات و چۆمان دەکرد. ئەو یادگارانە، لەو وەختەوە، لە قوولایی بیرەوەریمدا. نیشتبوونە خواردەو، ئێستاش بەم چەشنە سەریان هەڵدایەوە».

لەسەر لووتکەی سەری بەردی[1]
گەلێک جاران ڕاوەستاوم
زنجیرە چیای دەورو بەرم
وەک تابلۆ بوون لەپێش چاوم

●

نەواخین لەنزیک کورەک[2]
چەند قلیشێکی بردوە
دەڵێی دەستێکی ئاسمانی
بەم چەشنەی تێکشکاندوە

●

ئەو قەلیش و تێکشکانە
کە لەدوور بێ نموود دیارە
وەک بەناویا رادەبووری
گەلی پڕ تاقگەو ڕووبارە

●

لەخوارەوە شیوی شێخان[3]
بەهەوری ڕەش داپۆشرابوو
ئەو دۆڵە تەنگ و تاریکە
مەیدانی باران و بابوو

●

بەهاران ئەی شیوی شێخان
هەڵسانت چەند لەنکاوە
داخوا چەند جار پیادەو سوارت
بەیەک شەپۆل ڕاپێچاوە

●

به پایزان گەردەلوولە
پیرە دار بەرووی دەهەژاند
باوەش باوەش گەلای زەردی
وەك لیرەی زێر هەڵدەرژاند

●

لە سیدەکان چەند بەسام بوو
دیمەنی سپیی هەلگوردمان
کە پەیکەری تا هەتایە
بۆ سەربەرزیی گەلی کوردمان

●

ئای لەو رۆژەی لەهەوێلان[4]
رێگام بەرەو سیدەکان بوو
لەلایەك هەورو سامال بوو
لەلایەك رێژنەی باران بوو

●

لەپڕێکا وەك تەلەسمێك
کەوانێکی وا پەیدابوو
سەرێکی لەرۆژهەلات بوو
سەرێکی لە رۆژئاوابوو

●

رەنگەکانی هێندە تەر بوون
هێندە پرشنگدارو جوان بوون
سەوزو سوورو بنەوشەیی
وەك تاقی قوبەی ئاسمان بوون

●

حاڵەتێکی وا گرتمی
وەك حاڵەتی سۆفی مەستی
دیارە هەر ئەمەیە رازی
ئایینی جوانی پەرستی

●

ویستم لە سواری دابەزم
بەرامبەری ئەو کەوانە
خاکی کوردستان ماچ بکەم
کە هێندە پیرۆزو جوانە

●

ئەی کوردستانی خۆشەویست
بەردت دەخەمە سەرسەرم
خاکت بست بەبست ماچ دەکەم
پەلاست دەکەمە بەرم

●

خۆشەویستیت هێزو تینە
بەبێ سنوورو پایانە
خوێنی نێو دەمارو دڵە
تا مابم خۆراکی گیانە

●

ئیتر ئێستاکە نەخۆشم
بەهەرەی هەڵبەستم کزبوو
ئەگەر شعرێکیش بنووسم
تەووژمی ئەڤینی توە

●

٢١-٦-١٩٩٠

---

١ـ سەری بەردی لووتکەیێکە لەریزی (سەری حەسەن بەگ) و کەوتۆتە پشت چیای زۆزك.

٢ـ نەواخین ـ ئەو زنجیرەیە کە (گەلی) تێدایە. کورەك: چیای سەر رواندزە.

٣ـ شیوی شێخان: دۆڵ و روبارێکە کەوتۆتە نێوان زۆزك و سەری بەردیو هەڵسانی زۆر لەنکاو بوو گەلێك جاران کاروانچیی بەهێسترو بارەوە بردوە.

٤ـ هەوێلان: گوندێکە لەنێوانی سەری بەردیو سیدەکان.

# حەیران و لاوك

پێشکەشییت بۆ

هونەرمەند سەلاح ردئووف

بۆ هەموو

حەیران بێژو لاوك بێژە هێژاکان

حەسیب قەرەداخی

١ـ دەلێلێ، دەلێلێ، دەلێلێ، دەلێلێ
گەلی برادەرینە.. ئەمن نازانم نەشەوە نەنیوەشەوە نەبەرەبەیانە
نەدەمیشیوەن و قوربێوانە،
نەسۆزی لاوکە، نە ئاهی گەرمی حەیرانە
نە شەهیانە، نە لاوژەو هەڵپەرکێیە
نەقیرەقاجی سوارانە، نە تەقەیەو کێ بەرکێیە
دەلێلێ، دەلێلێ، دەلێلێ، دەلالم

★ ★ ★

٢ـ دەلالۆ، دەلالۆ، دەلالۆ، دەلالۆ
دەلالۆ خۆت مەشارەوە
ئەمن هاتووم لە شارەوە
بە پشتێ کۆڵ و بارەو
بە داستانی سەد ئەندێشەو ئازارەوە
دەلالۆ خۆت مەشارەوە
ئەمن بەرەو ئەولا دەرۆم، لە کن خەڵوەی دەروێشانێ
ئەوی رێیەم نیشان بدەن هۆ هۆ خەڵکە کێ دەزانێ؟
لە ویندەرێ گراوی من خۆی پەرییە
لە سیبەری عەرشی خوادا دێت و دەچێ خۆی دەنوێنێ
پەیام بە رووی دەروێشانا وەکوو ئاونگ دەپرژێنێ
دەلالۆ، دەلالۆ، دەلالم

★ ★ ★

٣ـ دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ
بە مسحاف و بەئینجیل و بەوی کەلام
سەلام، سەلام، هەزار سەلام
ئەی کورگەلی سەر ئاینی سۆزو ئەڤین
ئەگەر باوەر بە من ناکەن ئەوە زارم، ئەوەش برین
واچەند ساڵە بەهاردێت و گورێ دەروا
پایز دێت و هاوین دەخوا
رەمەزان دێ و چەژن نییە
چەژنان دێن و گەردن ئازادیی درۆیە
بەرەی بەڵێن یاهەر پۆیەو تانی نییە
یاهەر تانەو بەبێ پۆیە
هۆ مەحبووبە گچکەلەکەم من قەتارم
من قەتارەی ئەو مەلانەم جووت دەگرن و شەورەو دەکەن
ئەویندارانی جێژوان لە خەودەکەن
ئەمن گری عیشق و باوەر سووتاندوومی
هاتم، هاتم بۆ کوێستانی دەرباری تۆ
هاتم ، هاتم بۆ نوقڵانەی سەرزاری تۆ
مژدەم دەیتێ کە سۆزی من لات پەسەندە
مژدەم دەیتێ لە شەجەرەی عاشقاندا ئەڵقەی منیش بە تۆ بەندە.

دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلالم

★ ★ ★

٤ـ دەلالێ، دەلالێ، دەلالێ، دلۆڤانی
تۆ هەر جوان نیت، شای جوانانی
تۆ سەر چاوەی ئاوەدانی
ئەتۆ بووکی خەونی شوانی
بەو خودایە ئەمن نەبم هیچ کەس نازانێ چەند جوانی
«لە گورێ، لە سوورە گورێ، لە نارنجێ، لە ترنجێ» لە هەنارێ
لە دار گوێزێ، لە داربەروو، لە چنارێ.
یاهەر لە تۆ شیلەی شوکەو گەزۆو هەنگوینان دەبارێ؟!
ئەمن هاوارم هەر لە بەر تۆیە
«سەد وەستام دەوێ لە بانی کۆیە
هەشتا لە موسڵ، شێست لە شنۆیە
کراس بدوورن لە گوڵە لیمۆیە
دەبلا تەنك بێ
ناسك و شلك بێ
بۆ چاو هەڵۆیە»[1]
راستە عیشقیش سەرەرۆیە
داخۆ ئەمە تەنها دەردی من و تۆیە؟
رامووسانێك لە زاری تۆ بە هارێکە
لە کۆردەرەی دەروونمدا دەبەزێ
ئەوساکە گەورە شارێکە
دەلالێ، دەلالێ، دەلالم

★ ★ ★

پەردە نەما، پەردەنەما
دڵم کەوتە تەپەو سەما
نێوان چوو بە ناخی عەردا
لە هاوارو لە سکاڵاو دەستم بەردا
سەدایەك هات
لە دەروونی پڕ لە سۆزما هێدی هێدی
وا چلچرام بۆ هەڵدەکات

★ ★ ★

٥ـ دەلاوێ، دەلاوێ، دەلاوێ، دەلاوێ

کە رووت کردە چیای سیپان بە ڕێم کردیت
شەربایی من لە حەد دەرچوو
بوو بە رازی هەبوو نەبوو
دەلاوێ تۆ بزڤرێوە هەتا زووە بەرەو مەنزڵ
باخەڵیشم لێت حەرامبێ، لەسەر پشتە هەواری دڵ
دەلاوێ سۆزی من پەیکەهەواڵێکم بۆ بنێرە
لەسەر پشتی ئەسپە شێکەی هەوەڵ هەڵەتی خۆت ماوی؟
ئێستەش سواری ناو سوارانی..
یا سوارێکی تێگلاویو لەبەر چاوی؟
دەلاوێ بۆچ لەناو هەردەی عەشقی مندا دەڵێی وێڵی
سەرگەردانی بۆ نازانیت
بۆ بەستنی پردی دەلال. خۆم داناوە بە قوربانی پردی دەلال...
هەردوو بەری وارێ عیشق پەیوەست دەکا
پردی دەلال بە گیانی من دەبەسرێت و
باش وەستایان دەڵێن دەستی غەل و غەشی بۆ نەبراوە
هەرچی پردی ـ ئارتا ـ هەیە، لەم دنیادا، وابەسراوە
دەلاوێ تۆ بزڤرێوە ئەوەگیانم بۆم راخستووی
چرای عیشقی نوورانیی خۆم بۆ هەڵکردووی
دوێنێ کتێبی بەختی خۆم دەگرتەوە
مژدەی داپێم بە تێگلان تۆنە مردووی
دەلاوێ تووبەشقی خودا ئەوە دڵم
ئەوە گیانم
ئەوەش سروودی زامانم
ئەوە لێوی ئەوە دەمم
ئەوە زینم ئەوە شەمم
ئەوە زۆرم ئەوش خەمم
ئەوەش بابی خەمان دەگری
پردی دەلالان بە سراون
بزڤرێوە نەکەی بمری
دەلاوێ، دەلاوێ، دەلالم.

---

١ـ ئەم کۆپلەیەی لە ناو کەوانی « » دایە لە بەیتی خەزێم وەرگیراوە ـ کتێبی بەقامەکانی سێوەی ئەمر ـ کەریم شارەزا.

## دوو هۆزانێد میکائیلی ڕەشید

○ دارا حمید محمد ○

له پیتی سلاڤییەوه
ریویەتیه سەر نووسینی کوردی پیتی عەرەبی

# بایێ پاییزێ

دادواشن، دادواشن بەلگێ دارا،
ئو تەیرەدا فرین ئو چوون ژ ڤان دەدا.

تۆ بایێ سەر ئو سەوداسەر، چ دبەزی
ناڤ باغادا، ناڤ ڤان دارێد روت ئو تەعزی؟

بهار چوویە؟ بهار دیسا وێ پاشدادێ.
باوەر ناکی؟ ئەو یەك تەعڤا دایێك دبێ

هێی، بایێ سار، بەسە ئوسا بکی قزین،
چ دگەڕی مینا هەسپێ بێ گەم ئو زین؟

عەرد رازایە نۆ کەتیە خەوا شیرن،
بەلگ ژۆردا تێن ئو حوبا خوە ژێرا تینن.

پایین، پاییز! دۆربەرێ من رووت ئو تەعزی،
ئو تەك تویێ، بایێ گەڕوك، کو دبەزی

# خاچاتوور ئابۆڤیان

سبێ شەبەقێ ژ مالێ دەرکەتی،
ئو ئەو سبە بوو شەڤا عەمرێتە،
ژ مالێ دەرکەتی، پاشدا نەهاتی
ئو حەتا نها ژتە خەبەر تۆنە.

سال گران بوونە سەر سالا قوڕنێ،
ناڤێ تە مایە، کهیشتیە مە،
عەفراندنێد تە ئۆلا بارانێ
بهار خستنە دلێ مەرڤا.

سالێد گراندا جماعەتا مەڕا
تۆ هزمام بوویی، براکی ب دل،
هەر شئێرەکە مە دل - ڕۆحێ تەڕا
فەعم داری بوویە، نێزیك ئو عەزیز.

تە جماعەتا کورد نیشانی خەلقێدا،
تە جماعەتا کورد بلند کر دها،
ئو جماعەتا من ب حورمەتا کوور
ناڤێ تە ددە تەڤ کشکا نها

سال گران دبن سەر سال ئو قوڕنا،
ئو ڕیا تە دچە ناڤا قوڕنادا،
ئو ئەو ڕیا قوڕنا ڕیا جماعە تێیە،
لێ تە عەمرێ خوە وێرا گرێدا.

---

تیبینی
ئەم دوو هۆنراوەیە لە دیوانی «دلێ من»ی میکائیل ڕەشید وەرگیراوە کە لە یەریڤان چاپ کراوە لە ساڵی ۱۹٦۱

# محمد ئەمین عەصری کێیە ؟

لە مێژووی رۆشنبیری کوردیمان دا
پیاوی وامان تیادا هەڵکەوتووە بێ
قرموبرە بەبێ دەنگی
خزمەتی خۆیان کردووە،
لەو ساڵەکانی ژیانیشیاندا ماندویتی
ژیان چۆکی پێداداون و سەریان
ناومتەوە بێ ئەوەی یەکێك
دوو وشەیان لەسەر بنوسێت.

مصطفیٰ نەریمان

لە پەنجاکان دا کۆمەڵە کتێبێکی وەك (لەیل و مەجنون ، رۆستەم و برزو، غەزای بە دروحنین ، فەتحی قەڵای خەیبەر، خورشیدی خاوەر ، حەکایەتی مەلای مەشهور) کەوتنە بازارەوەو هەزاران دانەیان لێ چاپ کرا، بەهۆی ئەوکتێبانەوە کۆمەڵێك، فێری خوێندن و نوسینی کوردی بوون لەوێوە بازیان دایە سەر کتێبی ترو بوون بەخاوەن کتێبخانەی باش، ئەو کەسەی بیری لەوەکردەوە ئەم جۆرە کتێبانە چاپ بکات و بلاّوبکاتەوە خوا لێخۆشبو (محمد ئەمین عەصری) بوو کە لەسەرەتای پەنجاکانەوە تا نەخۆش کەوتنەکەی و مردنیشی پەیوەندیمان لەگەڵدا هەبوو بۆیە بەپێویستم زانی پانز دە ساڵ پاش مردنی ئەم چەند دێرەی لەسەر بنووسم .

رەحمەتی محمد ئەمین ساڵی ١٩١٠ لە کەرکوك لە دایك بووە لای مەلاکانی ئەو سەردەمە فێری سەرەتای زانستی ئایینی بوە لە سێیەکاندا توانیویتی ببێتە خوێندەوارێکی ئەوتۆ کەلە زمانەکانی عەرەبی کوردی، تورکی فارسی شارەزایی پەیدا بکات، لەدوا ساڵەکانی سێیەکان دەورەیەك بۆ ماموستایان کرایەوە، محمد ئەمینیش چوە ئەو دەورەیەو بوە ماموّستا سەرەتا لە قوتابخانەی (کەلار) دامەزرا ، ئنجا گوێزرایەوە دەورو پشتی کەرکوك، لەپشوی هاویناندا دەستی دایە کتێب فرۆشتن، چەندە هەوڵی دا بگوێزرێتە ناوشار بۆی نەچوە سەر ناچار پشتی لەوەزیفەی میری کردو هات لەبەری قەڵا لەساڵی ١٩٤٨ کتێبخانەیەکی دانا ، لەو سەردەمە لە شاری کەرکوك دووکتێبخانە هەبوو یەکیان کتێبخانەی (تەرەقی) لەمەر محمد ئەمین عەصری ئەویتریان کتێبخانەی (عەباس حیلمی) لەشەقامی مەجیدیە بو، کە تائێستا ئەو کتێبخانەیە ماوەو لە بازاڕی عەصری دایە.

عەصری یەك دوو سەفەری ئەستەمولّی کرد لەوێ بەبارو تەغار ئەو کتێبانەی کری کە بەپیتی عەرەبی نوسرابون و لەوێ فت کرابوون لەو کتێبانە پارەیەکی باشی دەسکەوت خۆم قاموسی ئەعلام و چەند بەرگێك لە مێژووەکانی ئەحمەد ئەمینم لێکری ، کەلەم کتێب کرینەی ئەستەمولّ دەمێ شیرین بوو یەك دوو

سەفەری تاران و قاهیرەشی کرد و لەوێشەوە کتێبی زۆری کڕی، ئەوەبو لە سلێمانی و هەولێرە]وە بۆ کتێب کڕین ئەهاتنە کنیو دەنگی دایەوە.

کتێبخـانەو مەخزەنەکەی عەصری پڕ کتێب بوون، کتێب لەسـەر کتێبی قەلا قەلا کرابوو تا کتێبێکی ئەدۆزیەوە شەیتـان شەقی ئەبـرد ئێمەش یارمەتیمان ئەداو بۆمان ڕێك ئەخستنـەوە ، سودی نەبـوو باوەڕی بەڕێك و پێکی نەبوو تا ڕۆژی تەقی دا لە جەرگم و پێم ووت (واللە کاك مـ.مد ئەمین ئەبێ بەتـۆ بوترێ حەجەری نەك عەصری) ئەو ئەم قسانەی نەئـەچـو بەگـوێیـا ، ئەوی کتێبی خۆش بوێ ئەیزانی خۆی ئەیدۆزیەوە نرخیشی بەدەست خۆی بوو، ئەوەندە بەتەنگ پاك و پوختـەیی و قورسی کتێبەکەوە ئەهات گوێی نەئەدایە نرخی سەر بەرگ یان ساڵی چاپکردن هەرزانی و گرانی بەدەست خۆی بوو، بەڕاستی پیاوێکی بەپشوو بوو.

دیسـانـەوە لەسـەرەتای پەنجاکان داوای لەهەندێ لە مامۆستایان کرد کتێبی بۆ بکەنە کوردی ئەمیش هەقی خۆیانی ئەدانێ و کتێبـەکانی یەك لە دوای یەك بە چاپ ئەگەیاند لەو مامـۆستـایـانەی هاوکاریان لەگەڵ ئەکرد (عەلی باپیر ئاغاو عبدالرحمان سەلامی، مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی، مەلا شەریفی خاڵە بازیانی و هەندێکی تربون).

زۆرمـان هان دا چاپخـانەیەك بکرێت تا هات و چۆی بەغـدای لە سەر بکـەوێت و خێرو بیرێکی بۆ وشەی کوردی هەبێت، ئەوەبـو بردمـە بەغداد و دەستم دایە دەست خواڵی خۆشبو (مامۆستا علاء الدین سەججادی) ئەوەندەی پێنەچو ساڵی ١٩٥٣ چاپخانەیەکی نیو داشتی دەست کەوت و هێنای لەیـەکێك لەخانوەکانیدا لەگەڕەکی (ئاوچی) لەوبەری بازاڕی (مزگەرەکان) دایمەزراند لە پێشدا لە بەغداوە وەستایەکی هێنا ئنجا یەکێك لە کوڕەکانی و مەلا ڕەشید فێربوون، منیش بەهۆی ئەو چاپخانەیەوە ساڵی ١٩٥٥ کتێبی (هەڵبەست بو قوتابیان) م تیادا چاپ کرد.

لەمـاوەی (١٩٥٠ ـ ١٩٦٥)دا خواڵی خۆشبـو محمـد ئەمین عەصری چ لەکتێبخانەکەی خۆیدا یان لە چاپخانەکەیدا ئەم کتێبە کوردی یانەی چاپکردووە:

١ـ لەیـلـو مەجنـوون ـ وەرگـێڕی ـ عەلی باپـیر ئاغـا ساڵی ١٩٥٠(چ)مەعارف .

٢ـ میعراجنامە وەرگێڕی عبدالسلام حەیدەری ١٩٥٢ (چ) مەعارف

٣ـ دیوانی طاهر بەگی جاف ١٩٥٣ ، (چ) نەجاح

٤ـ خورشیدی خاوەر ١٩٥٣ وەرگێڕی عەلی باپیر ئاغا ، (چ) تەرەقی

٥ـ اسماعیل نامەو ناگەهان ١٩٥٣، (چ) نەجاح

٦ـ حەکایەتی دزوقازی ١٩٥٣، (چ) زەهرا

٧ـ حەکایەتی مەلای مەشهور ١٩٥٣، وەرگێڕی مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی، (چ) تەرەقی کەرکوك

٨ـ وەفاتنامەی رەسول نازدار ١٩٥٥، بەغداد چ عەرەبیە

٩ـ نصـائـحی مفیـدە بەکوردی ١٩٥٥، وەرگێڕی عبدالسلام حەیدەری (چ) تەرەقی

١٠ـ غەزای بەدرو حونەین ١٩٥٥ وەرگێڕی مەلا شەریف خاڵە بازیانی، کەرکوك (چ) تەرەقی

١١ـ فەتحی قەڵای خەیبەر ١٩٥٥، چ تەرەقی

١٢ـ شوکردنی بێ دڵ ١٩٥٥ وەرگێڕی عەلی باپیر ئاغا (چ) تەرەقی

١٣ـ ڕۆستەم و برزۆ ١٩٥٥ وەرگێڕی فاتح فەتاح دۆلات بەغداد چ مەعارف

١٤ـ غەزای جبل ئوحود ١٩٥٦ وەرگری عبدالسلام حەیدەری (چ) تەرەقی

١٥ـ غەزەواتی محمد حەنیفە ١٩٥٦ وەرگێری عەلی باپیر ئاغا (چ) تەرەقی

١٦ـ سیرەتی حضرەتی محمد ١٩٥٦ وەرگێری مەلا محمدی کەریم (چ) تەرەقی

١٧ـ شیرن و فەرهاد ١٩٥٦ وەرگێری عەلی باپیر ئاغا (چ) تەرەقی

١٨ـ دەزگیرانی ئایشەخان ١٩٥٦، (چ) تەرەقی

١٩ـ حیکایەتی چڵ طوطی ١٩٥٦ وەرگێری مەلا عبدالرحمن سەلامی (چ) تەرەقی.

٢٠ـ شێخی صەنعان ١٩٥٦، چ تەرەقی

٢١ـ ئەمیر ئەرسەلان ١٩٥٦، وەرگێری عەلی باپیر ئاغا (چ) تەرەقی

٢٢ـ مەولود نامەی کوردی ١٩٥٧، (چ) تەرەقی

٢٣ـ کۆگای هونەر ١٩٥٧ ، وەرگێری مەلا عبدالرحمان سەلامی (چ) تەرەقی

٢٤ـ قیصدەی نور الصباح ١٩٥٧ وەرگێری مەلا عبدالکریمی بیارە (چ) تەرەقی

٢٥ـ گوڵستان ١٩٥٧ وەرگێری محمد فدا، (چ) تەرەقی

٢٦ـ حەیدەرنامە ، وەرگێری مەلا عبدالرحمان سەلامی ١٩٥٨ (چ) تەرەقی

٢٧ـ ڕۆستەم و جهانگیر، وەرگێری عەلی باپیر ئاغا ١٩٥٨ ،(چ) تەرەقی

٢٨ـ عاقدەی کوردی چاپی چوارەم ١٩٦٨ چ تەرەقی

٢٩ـ دیوانی طاهر بەگی جاف ١٩٦٩ بەغدا (چ) البصری

هەر لەشەستەکانەوە زەمانە رووی لە محمد ئەمین عەصری وەرچەرخاند لەلایەکەوە ناساغی لەلایەکی ترەوە ئەرکی ماڵ و منداڵ رۆژ بەرۆژ باریان قورس ئەکرد، کە ئەهاتە بەغداد ئەچومە ئەو ئوتێلەی کە لە حەیدەرخانە تیا دائە بەزی سەرم لێ ئەدا ، هەوڵم ئەدا دڵی بدەمەوە، بەڵام دڵ کەشکا وەك جاران چاك نابێتەوە بەوە دڵنیام ئەکرد کە خزمەتەکانی لە مێژووی رۆشنبیریی کوردیدا جێو مەقامی خۆێ کردوەتەوە، ئەوەبو رۆژی ١٣-١/١/١٩٧٥ بە یەکجاری چاوی لێك ناو کۆچی یەکجاریو ماڵئاوایی لێ کردین، لە رۆژنامەی (العراق)ی ژمارەی (٢١٦)ی رۆژی ٤/١١/١٩٧٦ بە ناونیشانی (جندي مجهول أدى دوره في نشر الكتاب الكردي ثم رحل عنا) کورتەیەکم دەربارە نوسی وا ئێستا پاش پانزدە ساڵ یادی خوێنەرانی خۆشەویستم خستەوە.

پاش ئەوەی (عەصری) کۆچی دوایی کرد چاپخانەکەی بەر یەکێك لە کورەکانی کەوت کە ئێستا گوێزراوەتەوە بەری قۆریەو کەرەستەی بازرگانی پێ چاپ ئەکات.

کتێبخانەکەشی وابزانم بەر کاك (عبدالخالق) ی کورە گەورەکەی کەوت تا ئێستا کتێبخانەیەکی سەرشۆستەی هەرماوە و ناوبەناو ئەو کتێبانەی باوکی چاپی کردبوون، چاپی ئەکاتەوە هومێدەوارم لەسەر هەمان رێباز بروات و بیخاتە سەر رێنوسی کوردی ئەمرۆمان و پێویستە بە دروستی ژمارەی چاپەکانی هەر کتێبێکش بنوسێت چونکە ئەمە بایەخێکی تایبەتی خۆی هەیە .

هەزار رەحمەت لەرەوانی پاکی ئەوزاتەی کە چارەکە سەدەیەك خزمەتی کتێب و وشەی کوردی کردوە مێش تاماوم نادی ئەم پیاوە بەنرخانە ئەخەمەوە یادی رۆڵەی ئەمرۆمان تا ئەو سەربازە نەناسراوانە بناسنەوە.

●

# ئۆپەرێتی کوردیو یێکەم ئۆپەرێتی رادیۆیی

● لێکۆلینەوەو ناشنا کردنی کەمال رەئووف محەممەد ●

■ پێشەکی

کە باژێـری قوستـەنتینـە ـ ئەستـەنبوولی ئێستا ـ ی پایتەختی بیزەنتینییەکان سالی ۱٤٥۳ی زایینی لەلایەن تورکە عوسمـانـی‌یـەکـانەوە داگیرکراو شارستانیی رما، گەلێ زانای یۆنـانـی ـ کە ولاتی خۆیان مەلبەندی نواندن و مۆسیقا بوو ـ ناچـارمان بەپرتاو چۆلی بکەن و سەر هەل بگرن و روو بکەنە ولاتانی خۆرئاوا.

ئیتالەکان جوان پێشوازییان کردن و جێگایان بۆ خۆش کردن. تەنـانـەت دەولەمەندەکانیان تا رەبەنەکانی کلێسەکان باوەشیـان بۆ کردنــەوە، بگرە پارەیشیان بۆ رشتن تاکەلکێکی چاکیان لە زانست و هونەرەکانیان وەرگرت.

مایـەی ئەم پێـوەنـدی‌یـە لە لاییکـەوە، دامـەزراندنی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی فیرەنزە ـ فلۆرەنسە ـ لە لاییکی دیەوە، هەل کەوتنی هونەرێکی نوێ بوو کە لە دەوروبەری سالی ۱٦۰۰ی زایینی‌یەوە هەتا ئێستا نێو بانگی بە (ئۆپێرا ـ Opera ) دەرکـردووەو لە ئەو هەلەشەوە گۆرینێکی مێژوویی گەورەیشی بەسەر مۆسیقای خۆرئاوادا هێنا، بەتایبەتی لە رووی داهێنانی هونەری (پێکخستنی ئاوازۆکەکانی دەنگەکانەوە ـ هارمونیە ـ Harmonie ).

ئۆپێرا ـ بە هەردوو جۆری کارەساتاوی‌و گالتەجاری‌یەوە ـ داستانێکی هۆنراوەیی شانۆیی گۆرانیی ئامێزە. هونەرەکانی نواندن، گۆرانیی‌و مۆسیقای دەستەی نوێنەرە گۆییندەکان و ئاهەنگی کۆمەلەسازی رێزکراو (تیپی مۆسیقا ـ ئۆرکێستڕا ـ Or-chestra ) رایـدەپـەرێنن. وێـراش بەکاربردنی پەردە دەنگی ـەرەبـەرزی پیاوی گۆییندە (چریکە ـ تینۆر Tenor )و پەردە دەنگی هەرە ناسکی ئافرەتی گۆییندە (زریکە ـ سوپرانو Sop-rono ) بەهاییکی جیاوازو شرینی دەنگ چرینی دەدەنێ.

ئەم هونــەرە جوان و بالایە کە لە خۆرهەلات دا هێشتا شوێنێکی ئەوتۆی نەگرتووە شایانی باس بێ: هونەرێکی دی لێبـووەتــەوە کە نێـوی (ئـۆپەرێت ـ Operetta )ەو لە نیوەی سەدەی هەژدەم دا داکەوت و پتر لە ولاتی فرانسەدا پەرەی سەند.

بنچینەی ئەم هونەرەش: چیرۆکێکی شانۆیی هۆنراوەیی گۆرانـیی ئامێــزە کە بەدەم نوانــدن و گۆرانیی‌و مۆسیقــاوە پێشکـەش دەکرێت، بەلام ئەم سەروبەر مەرجەکانی ئۆپێرای بەسەردا ناسەپێت چ لە رووی بابەتی داستانەوە چ لە رووی پشت بەستنی تەواوەتی بە ئاوازو مۆسیقاوە. هەروەها لەرووی جۆری پەردە دەنگی باس لێکـراوەوە. ئەم بۆیی هەیە لەهەلی نواندنی سەرشانۆدا وت وێژە (حوار ـ دیالۆگ ـ Dialog )ی بێ گۆرانیی و مۆسیقای تێبکەوێت.

هەرگـیــزیش چرینی گۆرانی‌یێکی دوو قۆلیی ـ بێ چیرۆک ـ

کەشێوەی وت و وێرەیشی هەبێ؛ ئۆپەرێت ناگرێتەوە ئەگەرچی وت وێرە کەرەستەیێکە لە کەرەستەکانی.

هونەری ئۆپەرێت لە دەمەو یێکەم چارەکی سەدەی بیستەم دا لەخۆر ئاوای وڵاتی عەرەبیش دا سەری هەڵ دا. بۆ وێنە لە نێو وڵاتی میسردا بەهۆی هێندێ شاعیرو مۆسیقارزەنانەوەدا کەوت.

شاعیرێکی بەنێوبانگی - باب کوردی - وەك ئەحمەد شەوقی «١٨٦٨ز - ١٩٣٢ز»ی خوێندکاری پێ گەییشتووی فرانسەو خاوەنی چەند چیرۆکە شانۆیی هۆنراوەیی وەك (کلیوپاترا، مەجنوون و لەیلا) هەروەها مۆسیقارزانێکی لێهاتووی وەك سەیید دەرویش «١٨٩٢ز - ١٩٢٣ز»ی خاوەنی نیزیکەی دووانزە ئۆپەرێتی وەك (شەهرەزاد، بەروکە، دەچاکان) ئەمانە پێشرەوی ئەم هونەرە بوون و کەسانی دیش هەروەها.

## ● ئۆپەرێت و ئێمە

بە پێچەوانەی ئەدەبی چینی خوێندەوارەوە، لە کۆنەوە لەنێو کورددا ئەدەبی گەل - میللیی - بابەتی داستان و بەیت و لاووك و هۆنراوەیی گۆرانیی ئامێزی هەبووە کە زۆر بەسەر زاری گۆیێندەکانی نێو کۆمەڵەوە بوون و گەلیش بە جۆشەوە گێراویتیەوە... «مەم و زین، خەج و سیامەند، لاووکی قایغان، لاس و خەزال، دەرویشی عەبدی، گەنج خەلیل و حەفسەد» وێنەی بابەتانەن کە زۆریان بەدەم ئاوازو مۆسیقاوە ئەدا کراون. راستی یێکەی ئەم یادگارە شیرینانە هەرچەندە بەشێوەی نواندن، هەروەها بەبەشداریی تەواوی کەسانی نێو بابەتەکانەوە - وەك ئافرەت - نەخراونەتە بەرچاو؛ شایانی ئەوەن بە (شێوەی ئۆپەرێتی میللی)ی نێو ببرێن.

بەڵام بۆ (ئۆپەرێتی هاوچەرخ) ئەوا بە رۆشنایی خوێندنەوەی بزووتنەوەی رۆشنبیریی کوردیی ساڵانی ١٩٢٠ز - ١٩٥٨ز، ئەم هونەرە لە نێو کورددا - بەگشتیی - لەبەر دوو هۆی کرنگ شوێن و بایەخ پێدانی دیاری پێ نەبراوە. لە لایێکەوە لەبەر دوواکەوتنی ئەدەبی کوردیی لە کاروانی ئەدەبی گێتیی و هونەرەکانی، لە لایێکی دیەوە لەبەر درەنگ هەڵ کەوتنی هونەری شانۆو رۆشنبیریی مۆسیقایی کە خوێندنیان باو نەبووەو مۆسیقازانی وردو زاناش هەڵ نەکەوتووە. بەڵگەی گەورەش بۆ ئەم راستی یە ئەو یێکەم کۆششە (شێوە ئۆپەرێت)ەیە کە ساڵی ١٩٢٧ز بەنێو (دلێران)ەوە لە لایەن شاگردانی قوتابخانەی یێکەمی سلێمانی یەوە پێشکەش کراوەو بنچینەی بابەتەکەیشی پەخشانێکی فرانسەوی وەرگێردراوی مەحمود جەودەتی رۆشنبیرە کە نووری شێخ ساڵحی شاعیر خستوویەتیە قالبی هۆنراوەی سروودی نیشتمانیی و ماموستایێکی مۆسیقای سوپایی و فێرکەری شاگردانی قوتابخانەی یێکەمی سلێمانی عەبدولواحیدی ئاغا مستەفای کۆیی لەسەر ئاوازی - فارسیی بێگانە - [دیشب کەمرا وضع وطن در نظر آمد] رازاندوویەتیەوە.

بەڵگەیێکی دیش ئەوەیە؛ وەك ئەو کۆششە لە رایەڵەی وریا بوونەوەیێکی رۆشنبیریی باژێری سلێمانی ١٩٢٥ز. داو گورێکی ئەدەبیی و هونەریی شانۆ پەروەری دا هەڵ کەوتووە: هەرچی بەرهەمێکی ئەدەبی شانۆیی - دانراوو وەرگێرادراو - هەیە تا سەرەتای پەنجاکانیش هەر بە پەخشانی ئەدەبی یەوە - نەك بە هۆنراوەوە - لەگەڵ هونەری شانۆ دوواون. وێراش ئاوازو مۆسیقاش چ کردەوەیێکی هەست پێکراوو کارامەی نەبووە. لەگەڵ ئەمەش دەبێت دان بەراستی دا بنێین کە نەبووە. لەگەڵ ئەمەش دەبێت دان بەراستی دا بنێین کە ئەو گورە ئەدەبی یە بەرە بەرە بووەتە هاندەرێ بۆ داهێنانی بیرو تەرزە هۆنراوەی نوێو هەوێنی (ئەدەبی ئۆپەرێت) کە رەگەزێکی یێکەمی ئەو هونەرەیە.

## ● رابەری ئەدەبی ئۆپەرێت - گۆران

بەڵێ کردەوە یێکەمەکەی نووری شێخ ساڵح - لە ئەو رۆژگارە ناسکەدا - وێنەیێکی کەڵك بەخش بووە بەڵام ئەوو پیرەمێردو رەشید نەجیب کە لە ئەدەبییات و هۆنراوەی نوێ خوازیدا لە ریزی رابەرەکان دا بوون، وەك (عەبدوڵڵا گۆران)ی شاعیری نوێپەروەر کارامەو بەگور نەبوون - تاسەر - بۆ ئەدەبی ئۆپەرێت، کە بێگومان ئەمیش هەنگاو بە هەنگاو بۆی چووەو تێی گەییشتووە تا پێی گەییشتووە.

یێکەم هەنگاوی گۆران - کە لای من دامەزرێنەری ئەم ئەدەبەیە - وت وێرەی هۆنراوەیی (گوڵی خوێناوی - س ١٩٣٤ز)ە کە هەتا ساڵی ١٩٤٦ز لە شانۆکانی سلێمانی

هەولێردا ـ وەك رەفیق چالاكی هونەرمەند دەگێڕێتەوە ـ هەر بەشێوەی وت و وێژە «دیالۆگ»ی شانۆیی پێشكەش كراوە. تەنانەت وەك سەرنجمان داوە، دووای ساڵی ۱۹۵۰ز ئەوجا بەدەنگی ـ چالاكی ـ مەحموود محەممەدو بەئاوازی رەفیق چالاكەوە وەكو «گۆرانیی لە رادیۆی كوردیی عێراق دا تۆمارو بلاوكراوەتەوە. بەڵام وا دیارە رۆشنبیریی گۆران لە ماوەی ساڵانی «۱۹٤۲ز ـ ۱۹٤٥ز»دا كەلەگەڵ رەفیق چالاك لە رادیۆی كوردیی یافادا «!» وێژەوان بوو، بەهۆی تێكەڵ بوونی لەگەڵ هێندێ ئەدیب و هونەرمەندو مۆسیقاژەن و نوێنەرەكان عەرەبی میسرەوە، گەشتر بووەو پتر ئاشنایەتیی لەگەڵ جۆرەكانی هونەر پەیدا كردووەو پتر شارەزای مەرجەكانی ئۆپەرێت بووە. بۆیێكە دەبینین لە (گوڵی خوێناوی)ی رازاوەترو لەگەڵ چاپ كردنی كۆمەڵە هۆنراوی یێكەمی (بەهەشت و یادگار ـ س ۱۹۵۰ز) چیرۆكە هۆنراوێكی یێك دیمەنی بەنێوی (ئاهەنگێك لە ناو ران)ی بلاوكردووەتەوە كە ئەمیان كۆكترو ناسكترو جوانترەو لە وەرزی بەهاری كوردستان دا هەستی «رێبواری ـ شوانێ، كۆمەڵێ ئافرەت»ی هێناوەتە جۆش بۆ هەڵپەركێی شادیی بۆ ژیانێكی شۆخ و شەن. [موخابن هەتا ئێستا ئەم پارچە هونەرە، تارای ئاوازو مۆسیقاو گۆرانیی بە خۆیەوە نەدیتووە!!].

لە لای من، گۆران هێشتا ئەو كۆششەیشی بەرامبەر بە هونەری ئۆپەرێت بە كەم زانیوە، بۆیێكە جارێكی دی، لە ساڵی ۱۹۵۳ز.دا كارامەتر كردەوەیێكی نواندووەو بە ئاشكرا لە خۆی رادیتووە نێوی لێبنێت (ئۆپەرێتی ـ ئەنجامی یاران).

ئەم بەرهەمە بەسۆزو خەمناكە كە چیرۆكێكی هۆنراوەیی یێك دیمەن و دووكاتییە ـ هەرچەندە دەماری بەربەرەكانیی سارده ـ چیرۆكی لاوچاكێكی نیشتمانپەروەرە كە رێبواری لادێیێكەو نێوی «برزوو»ەو لە یێكەم دیدارەوە لە سەرچاوەیێكی نێو كۆمەڵە درەختێكی سێبەردارا؛ كیژۆڵەیێكی دیتووەو عەشقی بووەو لە ئەو هەڵەشەوە سوێندیان بۆ یەكدی خواردووە كە ژیان و مردنیان پێكەوە بێ. ئەم گرێیەی دڵ؛ دووای ساڵی بەدەم گۆرانییەوە بۆ پیرێژنێكی نوورانیی كردووەتەوە بە پێدا هەڵ دانی یارەكەیدا وێنەی بۆ كێشاوە كە بەبەستی «مەنیج»ەو داخو لە كوێدا بێ!

پیرەژنیش ـ بەقسەی ساردو سەختەوە ـ وەڵامی دەداتەوە كە باوكی مەنیج؛ بۆ ماڵ و ژن بەژن گۆڕیویەتی‌یەوەو ئەویش پیشەی فرمێسك رشتنە.

هەفتەیێكی دی ـ كاتی دووەم ـ لە هەمان شوێن دا دەستە كورو كیژانی لاو ـ كۆرس ـ هەر یێكەو لەسەر گڵكۆی «برزوو»ی خۆ كوشتوو، لەسەر گڵكۆی «مەنیج»ی خۆخنكێن دا یەكدەگرن و بە جووتەش دەچریكێنن بۆ شەهیدانی عەشق و پەیمان دەبەستن كە مل كەچی كۆنەپەرستیی نەبن!

هەرچەندە ـ لە ئەو كاتەداو هەتا ئێستا ـ ئەو ئۆپەرێتە ئەدەبی‌یە تەرو پاراوو پڕ ئاوازەیە؛ تارای نواندن و مۆسیقاو گۆرانیی نەكراوە بە بەردا، گری خۆشەویستیی گۆران بۆ هونەری ئۆپەرێت نەكوژاوەتەوە، بەڵكو پێش جەژنی نەورۆزی ساڵی ۱۹۵۹ز بە پەرۆشێكی یێكجار زۆرەوە دەستی داوەتەوە دانانی ئۆپەرێتێكی نوێی هونەرانە كە (ئۆپەرێتی ـ ئەنجامی ئەژدەهاك)ە.. بەڵام بەهۆی كەلەبەری گەورەی لاوازیی نواندن و بەتایبەتی نەبوونی توانای مۆسیقاوە، هەر یێك پەردەی داناوەو لە تەواو كردنی ساردبووەتەوە.

ئەو كەلەبەرە ـ تەگەرە ـ گەورەیەی بەردەمی هونەری ئۆپەرێتی كوردیی بە رۆشنایتی ئەم قسانەی گۆران دا: دیسان لە ئێرەدا شایانی ناسینەوەیە دەڵێت (یەك دوو هەفتە پێش جەژنی نەورۆزی ئەمساڵ ـ ۱۹۵۹، لەگەڵ هونەرمەندی بەهرەدار كاك قادر دیلان بڕیارمان دا كە پێكەوە تەقەلا بدەین بۆ بەرهەم هێنانی پارچەیەكی هونەری بۆ ئەوەی لە جەژنی باسكراوا پێشكەشی گەلی شارە خۆشەویستەكەمانی بكەین. بەری تەقەلای من لەم پێناوەدا بیركردنەوەبوو لە دانانی ئۆپێرایەك ـ ئۆپەرێت كەمال ـ كە ئەمەی لای خوارەوە یەكەم پەردەیەتی. لەبەر كەم و كووری ئەو كاتەی بە دەستمانەوە بوو، بڕیارمان دابوو كە ئەو بۆ ئەم پەردەیە دەست بكات بە دانانی ئاوازەو پراوەكردن لەگەڵ تیپی ئاوازەو تیپی تەمسیل تا من لە دانانی پەردەی دووەم ئەبمەوە. وە بەم جۆرە بڕۆین تا ئۆپێراكە ـ ئۆپەرێتەكە كەمال ـ ئەگاتە ئەنجام، بەڵام داخەكەم كاك قادر بۆی نەكرا بەڵێنەكەی بێنێتەجێ! ئەمە بوو بەهۆی ساردبووەوەی منیش وە بەم رەنگە دەستم لە پرۆژەكە هەڵگرت.

ئێستا كە پەردەی یەكەم لە ئۆپێرای ـ ئۆپەرێت كەمال ـ ناتەواو

ئەخەمە پێش چاوی خوێندەواری "بەیان ـ گۆڤاری س ١٩٥٩ز کەمال» ئەگەر لە هونەرمەندەکانمان بە مۆسیقارو ئاکتۆرەکانەوە «!» هان دان و بەڵێنێك ببینم بۆ پشت گرتن و هاوکاری لەسەر پێگـرتـنـی پرۆژەدا، ئەوا ئامـادە بوونم پیشـان ئەدەم بۆ تێهەڵچوونەوەو تەواوکردنی پەردەکانیتر گۆران)

ئەم هەنگاوە پیشکەوتووە ناکامەی گۆران، پتر ڕێگەمان بۆ خۆش دەکـات تا بڵێـین: خۆشەویستی‌و توانای گۆران بۆ ئەدەبی ئۆپەرێت ـ بەڵکو بۆ تەواوی هونەرەکە ـ هەتا هاتووە دراوەتـە دەست جڵەوی ئەسپی بەهـرەی نایـابی لە شیعری نوێدا بۆ گەیـانـدنی بە بەرزیی، بەڵام وا دیـارە کەلەبەرە ـ تەگەرە ـ باس کراوەکە بەری لێگرتووە، بەڵکو بەری نەش و نما کردنی هونەری ئۆپەرێتی گرتووە.

هەرچـۆنێ بێ، ئەو کۆششـانـە دڵنیـامـان دەکەن کە «گـۆران» بەراستیی داهێنـەرو پێشرەوی ڕاستی ئەم شێـوە ئەدەبە ئۆپەرێت خوازیە بووە.

شایانی باسە بشڵێن کە ئەو چەند هۆنراوە شانۆیی‌یە یێك پەردەیی‌یە کورت و نووسراوانەی ساڵی ١٩٥٣؛ وەك: (ماستاو، جۆقی یونسکـۆ، موحاکەمەی مام چەوەندەر، جق ونق) پتر بۆ «ئۆپەرێتی گاڵتە جاریی ڕادیۆیی» دەست دەدەن کە موخابن هێشتا دەستێکی هونەرمەندانەیان بۆ نەبراوەو بێناز ماونەتەوە!!

● **ئۆپەرێت و کامەران موکری**

پێم وایە زۆر لەڕاستیی دەکەین ئەگەر ڕاست و رەوان نەڵێـین: هونـەری «گـۆران»ی شاعـیر کاری کردووەتـە سەر (محەمەد ئەحمەد تەها ـ کامەران موکری)ی شاعیر، بەتایبەتی لە رووی شێوازو ئاوازەوە.

ساڵی ١٩٤٦ز کە لەمێـژبـوو «گـۆران» بە هونـەری هۆنراوەی نوێوە ئاسۆی ئەدەبی کوردی ڕازاندبووەوە، کامەران ـ ئەو کاتە ـ تازە بەتازە لەتەمەنی ١٦ ـ ١٧ ساڵان دا لە گۆڤاری (دەنـگـی گێتی‌ی تازە)دا [٢] هۆنـراوەی بڵاو کردبـووەوە. هەروەها لە ئەو ساڵەش دا لە سلێمانی‌و هەولێرو شەقڵاوەدا ـ لەگەڵ کورە کورەی سلێمانیی ـ وەك نوێنەر لە چەند چیرۆکێکی شانـۆیـیـدا بەشـدار بوو کە تەنـانـەت لە ئەو هەڵەش دا

ـەرچاوی خۆیەوە؛ وت و وێرەی (گوڵی خوێناوی)ی گۆران ەش دەکرا. وێراش کامەران خۆی لە پێشەکیی کۆمەڵە ‌وی (دیاری ـ س ١٩٥٧ز)ی چاپ کراوی‌دا: بەئاشکرا ‌یەنگیری شێوازی تازەی هۆنراوی گۆرانە.

لەبـەر ئەم ڕوشنـاتیـیـە ـ هەرچـەنـدە ئێرە جێگـەی بەراووردی هۆنـراویـان نی‌یە ـ ئێمە بە دڵنیایی‌یەوە دەڵێین: کاری گۆران لە کامەران دا گەیشتووەتە (دانانی ئۆپەرێت)یش.

ئەوەتە کامەران ـ دووای گۆران ـ **یێکەم بەرهەمی جوان** و نایابی! یێکەم ئۆپەرێتی خۆی بە ئەدەبی کوردیی بەخشیوە، تەنـانـەت سڵ ناکـەینەوەو دەڵێین: ئۆپەرێتە کەیش لە رووی بابـەت و ئامـانجی گیـانی بەگیـانی‌یـەوە، نێزیکاتیی لەگەڵ ئۆپەرێتی (ئەنجامی یاران)ی گۆران هەیە؛ ئەگەرچی دەماری بەربەرەکانیی لە ئۆپەرێتەکەی کامەران دا گەرمە.

● **ئۆپەرێتی ـ دڵداریی کورە شوان**

ئەم بەرهەمە دەگمەنەی کامەران موکریی کە لە کۆمەڵە هۆنراوە چاپ کراوەکانی ـ هەروەها لە سەرجەمی دیوانی ـ دا نی‌یەو (ون)ی کردووەو لە هیچ بۆنەیێك دا نێویشی نەبردووە بەختی هەبووە لە کاتی خۆیدا وەك (یێکەم ئۆپەرێتی ڕادیۆیی کوردی)ی لەلایـەن تیپی ڕەسمیی نوانـدنی ڕادیۆی کوردیی عێراقەوە: ناسراو بە (تیپی ڕەفیق چالاك) تۆمارو بڵاوکراوەتەوە کە (ئاوازەکەیشی دانراوی ڕەفیق چالاك)ی بەهرەدارە. [نەك مۆسیقازان!].

**لە ئەم ڕووەوە کە ئێمە یێکەم کەسین (مەتنە ئەدەبی یێکە دەبـووژێنینـەوەو باسی ئۆپـەرێتـەکـەیش ئاشنـا دەکـەین) پێویستی دەزانین چەند لایەنێ ڕوون بکەینەوە:**

١ـ ڕەفـیـق چالاك لە یاداشتی دەستنـووسی ساڵی ١٩٧٢ی خۆیدا نووسیـویەتی: (بۆ جاری یێکەم لە مێژووی نەتەوەی کوردو ئیستگەش ـ ڕادیۆ کەمال ـ دا ئۆپەرێتی «دڵداریی کورە شوان»ی محەممەد ئەحمەد تەها ـ کامەرانم تەلحین کردو بۆ ماوەی «٣٥» دەقیقـە بە گەورەترین تیپی مۆسیقای هەوایی‌و وەتەریی لەئیستگەوە، بە ئاوازو تەمسیلەوە بڵاوکرایەوە. هەشت دەنگ بە گۆرانیی ئەدای ئەکردو گەورەترین سەرکەوتنی وەرگرت. تەواو بەدەستکاریی ڕینووسیەوە).

٢ـ دەفتـەرێکی دەستنووسی ڕەفیق چالاك کە (مەتنە ئەدەبی ییکـەی ئۆپەرێتکەی تێدایە) ئەم هەواڵانەی تێدا نووسراوە:
(چیرۆکی تەمسیلی بەگۆرانیی ـ بۆ سێ شەموو ٢٩/٣/١٩٥٥.
ئۆپەرێتی: دڵداری کورە شوان ـ اوپریت حب الراعي. تمثيلية شعرية. شعر محمد احمد طه ـ دەستکاریی و ئاوازی ڕەفیق چالاك.).

هەروەها لەسەر بەرگی نێو دەفتەرەکەش دا ئەم هەواڵانە تۆمار کراوە: (دەورەکان:

١ـ شوان ـ ڕەفیق «ڕەفیق چالاك».
٢ـ نازەنین ـ ئەحمەد «ئەحمەد مەحموود دەنگ گەورە».
٣ـ باوك ـ نووری «نووری عەنبەر».
٤ـ ئامـۆزا ـ دلاوەر «ئـەحمـەد دلاوەر» تەواو. ئاشنا کردنی تەواوی نێوکان لەلایەن خۆمانەوەیە.)

هەروەها ئەم هەواڵانەش ـ لەمەر فێڵی هونەریی ڕادیۆیی بەکاربراو ـ لە دەفتەرەکەدا وا نووسراون:

١ـ دەنگی پێی وڵاخ سوار لە نزیك و دوورەوە.
٢ـ دەنگی بولبول و باڵندە.
٣ـ دەنگی سوار لە دوورو نێزیکەوە.
٤ـ مۆسیقای خەمگین ـ تیپی مۆسیقای ئێستگە.

٣ـ وشەی «دەستکاریی ـ ڕەفیق چالاك» لەلای من مانای دەستکاریی هونەری هۆنراوەکان ناگرێتەوە، بەڵکو پێم وایە لە پێناوی پتر چەسپاندن و دەربڕینی هونەر نواندن و گۆرانیی؛ هێندێ بەیت دووبارە کروانەتەوە وەك:

**(بەلەنجەو ڕەوتێك جوانتر لە هی مەل؛**
**سەرکەوە سەرکەوە سەرکەوە سەر کەل)**

کە ئەمە بە تێهەڵکێشی ڕەفیقی دەزانم وەك تێهەڵکێش کردنی وشەی (ئای!)ی وێنەژانی شوان لە کاتی سزادانیدا کە هیچ پێوەندیی بە کێش و ئاوازەی هۆنراوەکەوە نییە.

هەروەهـا دیسان (ئەم تاکە)ش بە تێهەڵکێش، یان دانراوی ڕەفیقی دەزانم لە لاواندنەوەی نازەنین دا کە نووسراوە:

**(بە دەنووکی ئاڵ بۆم هەڵکەنن گۆڕ.)**

٤ـ ڕەفیق چالاك لە مەتنی دەستنووسەکەدا ـ وەك باس کرا ـ نێـوی چوار کەسی نوێنـەرو گوێنـدەی بردووە کە ئەمە پێچـەوانـەی قسـەکانی یاداشتە دەستنووسەکەی ١٩٧٢ی خۆیەتی کە گوتوویەتی «هەشت دەنگ!»؛ بۆ ئەم لایەنە، من پێم وایە لە ڕایەڵەی ئۆپەرێتەکەدا ـ هەر خۆیان ـ لاسایی (دەنگە دەنگ)ی پیاوانی ئاغایان کردووەتەوە تا نواندنەکە چڕ تر بێ؛ کە ئەمـەش وەکـو فێڵی هونەریی دی ڕادیۆیی لە نواندنەکەدا بەکاربراوە. [من خۆم ـ کاتی خۆی ـ ئۆپەرێتەکەم لە ڕادیۆوە وا بیستووە.].

٥ـ وەك سەرنجی مەتنە ئەدەبییەکەی دەستنووسەکەم داوە ـ لە ئێرەش دا دەبینرێتەوە ـ ڕەفیق چالاك (تەریب « ـ »ی لە نێوان بەیتەکانی سەرزاری نوێنەرە گوێبیندەکان دا داناوە. من پێم وایە ئەمەی لە خۆڕا نییە، بەڵکو ڕام وایە ئەمەی وەکو (نیشانەی جوێ کردنەوەی کۆپلەیەکان گۆرانییچڕین) داناوە کە بە دوواییان دا ئاوازی مۆسیقا یان ڕستەی مۆسیقا هاتووە.

٦ـ بە وردبوونەوەو سۆراخی زۆرم دا بۆم ڕوونە کە ئەم ئۆپەرێتە ڕادیۆییە، کاتی خۆی لەسەر قەوانێکی ڕادیۆییدا تۆمارکراوەو دوواییی خراوەتە سەر شریتی موگناتیسرێژ، بەڵام وا دیارە ـ لە ڕۆژگاریدا ـ قەوانەکە لەدەست چووەو شریتەکەش وەك ٩٩٪ی چیرۆکە تۆمارکراوەکانی ئەم تیپە سردرابێتەوە. چەندیش لێی گەراوم و لەنێو خەڵکیش دا سۆراخیم کردووە، هەر دەستگیرم نەکردووە.

٧ـ لە ساڵانی ١٩٨٨ز ـ ١٩٨٩ز. دا چەند جارێ پرسم بە ئەنـدامێکی زیندووی ئەو تیپە کرد کە (ئەحمەد مەحموود دەنگ گەورە ـ نازەنینی ئۆپەرێت)مکەیەو ڕووم لێنا کە شێوەی ئۆپەرێتەکە (یاد بکاتەوەو تۆماریبکەم) بەڵام ئەم ئاواتەم هەر نەهاتە دیو لەبەر سەرقاڵیی خۆی هەر هێندەی بۆ گێرامەوە گۆیـا: (ڕەگـەزی ئاوازی مۆسیقـای ئۆپـەرێتـەکـە مەقـامی نەهاوەندەو ڕەزمی تانگۆی تێکەڵە).

هەروەهـا گوتی: (مۆسیقاژەنی ناسراو غانم حەدادی سەرۆکی تیپی مۆسیقای ڕادیۆ؛ سەرپەرشتی ڕێکخستنی مۆسیقای کردو عەبدوڵا عەززاوی دەرهێنەری بووە!).

هیـوادارم کەسـانی کە پەرۆشی ئۆپـەرێتو مۆسیقان ـ بەبـیرێکی زانستـانـەوە ـ ڕوو لە هەردوو ئەندامی زیندووی بەشدار بووی ئۆپەرێتەکە؟ (ئەحمەد مەحموودو نووری عەنبەر ـ هەردوو دانیشتووی باژێری سلیمانی) بنێن تا چەند بۆیان

کرا بەرهەمەکەیان بۆ یادو تۆمار بکەنەوەو کار ئاسان بۆ سەر لەنوێ ئاوازی تەواوی ئۆپەریتەکە ببوژێتەوەو رەنجی هونەری رەفیق چالاکیش نەشێوێ‌و ون نەبێ.

**●مەتنی ئۆپەریتە ون بووەکەی کامەران موکری**

**دڵداریی کورە شوان**

«کـات دەمـەو بەیانەو سەرەتای بەهاری بەهاداری پڕ ئەفسوون و دڵداریی.. شوێن مێرغوزارێکە مەڵبەندی یاریی»

[دەنگی بولبول و باڵندە]

شوان: «بەگۆرانی‌یەوە»

گرنگی زێرینی خۆری بەیانیی؛

خۆی سوو

لە لالەو سەر سنگی کانیی

ئاوێنگی سەر گۆنای گوڵی سوور تکا؛

سوپاکەی زستان رای‌کردو شکا

خۆر دەمی ناوەتە ناوجەرگەی گوڵزار؛

تافگەی چەم ئەروا بۆ دامێن نزار

هۆزارو پەپوولە لە عەزرەتی گوڵ؛

ناسڵەمێنەوە لە درك و چقڵ

بەهارەو بەهار کاتی دڵداریی؛

کاتی بردنە سەر شەو بە بێداریی

وەرە نازەنین ئارامی گیانم؛

تاقانەی ئاغا، چرای ژیانم!

نازەنین:

وا هاتم گیانە، شوانی بالابەرز؛

بینیت گشت دەم لێم بووە بە فەرز

سا لەگەڵ ئاوازەی بەسۆزی شمشاڵ؛

لەرەی بێت ژێر ملی بێ‌گەردت چاوکاڵ

شوان:

گیانەکەم نازەنین پۆلایی بروا؛

چۆن ویرات بێیتە لام بێ‌ترس و پەروا؛

ناترسی خەنجەری زۆرداریی لە پڕ؛

برژێنێ خوێنی دڵ لە ناکاو بەخوڕ!

نازەنین:

هەرگیز ناترسم خۆشەویستەکەم

گەر بۆشم حازرکەن دارەمەیتەکەم

کورە شوان، شوانی جوان دڵنیابە تۆ؛

دڵی من بۆ تۆیەو ناتکەم دەسخەرۆ

هەر تۆ یارمی هەتا دووا نەفەس؛

بەڵێن بێ دووای تۆ دڵ نەدەم بەکەس

(-)

شوان:

دڵنیام گیانە لە وەعدو پەیمانت؛

لە هەستی ناو دڵ و هۆش و زمانت

زرەی زێر بە قوربان دەنگی تریقەت؛

بریسکەی بە قوربان خەندەو بریقەت

سەرکەوە سەرکەوە سەرکەوە سەر کەل؛

تاخۆزگەمان بێ‌بەرن کچ گەل و کور گەل

بە لەنجەو رەوتێك جوانتر لە هی مەل؛

سەرکەوە سەرکەوە سەرکەوە سەرکەل.

(-)

نازەنین:

کۆشکەکەم بە قوربانی خاکی ژێر پێتە؛

سەرو دڵێشم دایم لە رێتە

هەر تۆ یارمی هەتا دووای نەفەس؛

بەڵێن بێ دووای تۆ دڵ نەدەم بەکەس

[تاوێ موسیقا]

باوك:

«لە دوورەوە»

پێم نالێن ئەو دەنگە دەنگی کێ‌یە دی؛

لەو کەژەی ئەوبەر بێباك هەڵئەسێ

پێم بڵێن نۆکەرینە، خێراکەن؟

کچە کێ‌یەو کورە کوری کێ؟

ئامۆزا:

ئاغا ئەو دەنگە نازەنین خانە؛

دڵدارەو سووتاوەو گیرۆدەی شوانە

گوێت لێیە پێی ئەڵێ هۆ هۆ کورە شوان؛

نەك خۆم باوکیشم ئەکەم بە قوربان

باوك:

ئا سوار بن بە تاوێك بەرەو دەمی کەل؛

ئەو شوانەم بە خەنجەر بۆ بکەن پەل پەل

لاشەکەی فرێ‌دەنە بەردەمی قەڵ و داڵ؛

جلە خوێناویەکانی تاقەت کەن لە چاڵ.

[دەنگی غاری وڵاخ، دووایی تاوێ مۆسیقا]

نازەنین:

گیانەکەم لاوی پاك شوانی دیدە کاڵ؛

کوا دەنگی گۆرانییت، سۆزەی ناڵە ناڵ؟

بێنیتە شایی جەنگەڵی قەدپاڵ؛

دوژمن بسووتێنێ‌و بیکا بە زووخاڵ.

شوان:

گیانەکەم نازەنین پۆلایی بروا؛

چۆن ویرات بێیتە لام بێ ترس و پەروا؟

ناترسی خەنجەری زۆرداریی لەپڕ؛

برژێنێ خوێنی دڵ لە ناکاو بەخوڕ؟

نازەنین:

«لەنێو دەنگە دەنگی پێی وڵاخ دا»

ئەوە چیە؟ هەی هاوار! هەی هاوار!

شوان:

مەترسە گیانەکەم خەنجەری زۆردارە بۆ سنگی دڵدار!

باوك :
مەيكوژن جارێ، هەتا ئەدەم قەرارێ؛
ئا، با بەدار قەپرغەكەی بكەم بە خرخاڵ
بەشكو گلێنەی بكەم بە زووخاڵ،
مەيكوژن، بەسووژن چاوی دەردێنم؛
بەخەنجەر خوێنی دڵی ئەرژێنم

نازدنین:

بابە ! كوا رەوای كاری ئینسانە؛
ئێوە وا بكەن لەو بەسەزمانە!
تو خوا مەی كوژن، خەڵقە دڵداره؛
خۆشەويستی منە ئەم شوانە هەژارە
لە جێی ئەو: ها دڵی من ئەنجن ئەنجن كەن؛
چاوی من بەسووژن دەرزی ئاژن كەن.

شوان :
ئای ! بێویژدانینە! ئای ئارام، قەرار!

نازەنین :
مەيكوژن تو خوا! هاوار سەد هاوار!

شوان :
مەترسە! خەنجەری زۆردارە بۆ سنگی دڵدار،
دووایی ناهەموار!

نازەنین :
كورە شوان بەقوربان سۆزی كوڵت بم:
بە قوربان دڵۆپێك خوێنی دڵت بم

باوك :
كوا زيرەی قامچیو دار لەسەر پشتیبێ؛
ماندوو بوون، دارزێن، هەی دەستان شكێ؟

شوان :
بمكوژن . خێراكەن بەبێبێ سزا؛
بەلام بێگومان بن كە ئەيخۆن جەزا ... ئای
[تاوێ مۆسيقای خەمگین].

نازەنین:
دەمەو بەيانەو سەرەتای بەهار؛
كەچی ماتەمەو شەپۆری دڵدار
ئەوتان كوشت بەلام دڵ تاكو ماوە؛

بۆ ئەو شینیەتیو بۆ ئەو سووتاوە
دەك بن بە قوربانی باڵی بەسراوی
رەنجبەری برسی، لامل خوێناوی
( - )

ئامۆزا :
نازەنین شێت بوو ویڵ و پەیتارە؛
كەژاو كەژ ئەكاو دڵ پڕ جەخارە
ئاواتی دڵی خرايە ژێر خۆڵ؛
ئەميش ئاوارەی دەشت و چياو چۆڵ
گرتوويەتیە بەر رێگەی نەهاتیی
بەدەم نێشەوە سەد مەرگە ساتیی
( - )

نازەنین :
«بەدەم لاواندنەوە»
ئەی مانگ تا مردن هاورێی تيشكی تۆم!
سەرێنم بەردەو نا رۆژ تل ئەخۆم
شەماڵی هاودەم ئەی سۆزەی شمشاڵ!
كوا نيگای مەنگی شوانی ديدە كاڵ؟
ئەی مەلانی شاخ وەرن بگرن كۆر
تێكرا با بيكەين بە شين و شەپۆر
(بە دەنووكی ئاڵ بۆم هەڵكەنن گۆڕ)
ئینجا با بمرم بێ ئاواتی دڵ
سيس بم، بوەرێم وەكو پەرەی گوڵ.

● تەواو ●

★ **تێبینی**: ئەم لێكۆڵینەوەیە لە نێوەندی مانگی نيسانی ۱۹۹۰دا بۆ رۆژنامەی «ئاسۆ» نووسراو لە ژمارە «٥٣»ی رێكەوتی ٤ی ئابی ۱۹۹۰دا (بەشێكی بلاوكرايەوەو ئیدی بلاوكردنەوەی بەهۆی راوەستانی رۆژنامەكەوە ـ راگیرا). لەبەر گرنگی بابەتەكەو بەتايبەتی (ئاشنا كردنی ئەم بەرهەمە ونەی كامەران موكری) پێويستم زانی كە سەرلەنوێ لە خوێندەوارانی بگەیێنم، بەتايبەتی بەهۆی گۆڤاری «كاروان»ەوە.

●

● هونەر

# پاشماوە هونەرییەکانی کویسنجق لە لێکۆڵینەوەیەکی جیهانیدا

لە ئاسۆی هونەری جیهانیدا

● محمد عارف ●



ریلیفی «پلنگی بریندار» کویسنجق. موزەخانەی بەریتانیا



نەخش و نیگاری عەتەبەیەک کویسنجق. موزەخانەی بەریتانیا

مێژوونووسی فەرەنسی بەناوبانگ (ئەرنست بابیلۆن)، لە پەرتووکی: (پاشماوە هونەرییەکانی ڕۆژ هەڵات)، کە باسی هونەری شێوەکارو بنیاسازیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات و وەك زانایەکی ئەرکیۆلۆژی کە ساڵەها ساڵی لەم ناوچە گرنگە لە پشکنین و لێکۆڵینەوە، بردوەتەسەر، کە باسی هونەری ئاشوریو پاشماوە هونەرییەکانی ئەنتیکی لە عیراق دەکات، لە نێو شارەکانی وەك: هەولێر، نوور، نەمرود، شەرگات، مەردوخ، نەینەوا، بابل، وەرکا،... هتد لەچەند لاپەرەیەکی ئەم پەرتووکە، ناوی کویسنجق دەهێنێ. (ئەرنست بابیلۆن)، زانای شارستانیەتی کۆنی عیراق واتە (میسوپۆتامیا یانی: وولاتی نێوان دوو ڕووبار)، یۆنان، فارس و وڵاتەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە.

ئەم مێژوو نووسە لە ماوەی ژیانیدا پەنجا پەرتووکی بە نرخی دەربارەی هونەرو شارستانیەتی ڕۆژ هەڵات داناوەو ساڵی ١٩٢٤ لە پاریس کۆچی دوایی کردوە.

● پەرتووکی (پاشماوە هونەرییەکانی ڕۆژهەڵات)ی (بابیلۆن) ٢٧١ لاپەرەیە، ساڵی ١٩٨٧لە لبنان چاپ کراوە. نووسەر کە باسی هونەری ئاشوری دەکات، کە ئەو کاتە ئیمپراتۆریەتیکی زۆر گەورە بووە، باسی پاشماوە هونەرییەکانی کویسنجق دەکات و دەڵێ:

«ئەم شاکارە هونەرییانە لە ژێر گردو هەریمەکانی دەوروبەری کویسنجق دۆزراونەتەوەو بەشی زۆریشیان لە مووزەخانەی (بەریتانی) لە لەندەن و لە مووزەخانەی (لووڤر) لە پاریس پارێزگاری کراون». نووسەر پێنج تابلۆشی وەك نموونەی هونەریی لەگەڵ باسەکەیدا بڵاو کردوەتەوە، ئێمەش هەرپێنجیان لە (ئاسۆی هونەری جیهانی) بڵاو دەکەینەوە.

● (ئەرنست بابیلۆن) لە پەرتووکەکەیدا لە لاپەرە (٦١، ٧٨، ٨٦، ٨٨، ٨٩، ١١٢، ١١٣، ١٤٨، ١٥٠) ناوی کویسنجق دەهێنێو بەرهەمە هونەرییەکانیشی لە لاپەرە (٨٢، ٨٤، ٨٦، ٨٩، ٩٠) بڵاوکردوەتەوە.

بەشێکی ئەم پەیکەرانە (زۆربەیان پەیکەری زەقن واتە: ریلیف)ن، مۆرکێکی هونەری ئاشۆریان هەڵگرتوەو لەم ڕووەوە نووسەر ڕێزێکی تایبەتی لەو بەرهەمانە دەنێو دەڵێ (رواقی کویسنجق لە مووزەخانەی لەندەن، زۆر لە هۆڵی ئاشووری) جوانترە کە لە مووزەخانەی لووڤری پاریسە). (لاپەرە ٧٨).



ئاشوربانیبال. کۆیسنجق

مۆزەخانەی بەریتانیا



ریلیفی

ئاشووربانیبال

کۆیسنجق

مۆزەخانەی لووڤ.

پاریس

نووسەر لە لاپەرە ٨٥، ٨٦ دا باسی شاکارێکی پەیکەرتاشین دەکات کە لە ئاستێکی جیهانی ناسراوە، ئەویش ریلیفی (پلنگی تیرباران کراو)ە، ئەم پەیکەرە دەربڕینی پلنگێکە کە هەموو لەشی لەلایەن راوچییەکانەوە تیرباران کراوەو تەنانەت تیریك لە بڕبڕەی پشتیشی دراوە و بە زۆر خۆی رادەکێشی، بەڵام بە سەربەرزی تەماشای ئاسۆ دەکات. ئەم بەرهەمە لە ـ مووزەخانەی بەریتانیا ـ لە لەندەن دانراوە.

زانای ئەرکیۆلۆژی بابیلۆن، لە لاپەرە (٨٩)دا وێنەی نەخش و نیگارێکی جوانی بڵاوکردوەتەوە، کە ریتمێکی زەخرەفی لە دارو رووەك وەرگیراوی هەڵگرتووە دەڵێ «ئەم جۆرە نەخش و نیگارە بۆ عەتبەی خانووەکانی بەکارهێنراوە و ئێستاش لە مووزەخانەی بەریتانی پارێزگاریی کراوە».

لە لاپەرە (٩٠)دا، وێنەی هەڵگرتنی (گای باڵداری پیرۆز) کە بۆ (پاسەوانیی دەرگا مەزنەکانی شارو کۆشکی میری) دروست کراوە، بڵاوکردوەتەوە. (گای باڵدار) لە سەنتەری بەرهەمەکە، لە باشترین جێی سەرنج راکێش، چەسپاوە، دابەش کردنی فیگووری ژمارەیەکی زۆری ئەو دیلانەی کە گایەکەیان هەڵگرتوە، بە شێوەیەکی نەخش و نیگاراوی واتە زەخرەفی، دابەش کراون و لەرووی ـ دامەزراندنی هونەریی ئەم بەرهەمە، شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشە.

● نووسەر بێجگە لەپەیکەر، باسی هەرێمی کویسنجق دەکات، کە چۆن خشڵی ئافرەتانی لێ دوزراوەتەوە، لەوانە باسی خەناوکەیەکی نایابی لە ژێر دروست کراو و بازنەکی زێر دەکات، کەچۆن هەردوو سەری بازنەکە بە پەیکەری سەری شێر رازابۆوە. ئەم شاکارەش لە مووزەخانەی (لووڤر) لە پاریس دانراوە.

● زۆر ناوی شارستانیەت و هونەری عیراق، لە پەرتووکی مێژوو نووس و رۆژ هەڵاتناسەکان هاتوە. ئەوەش جێی شانازی هەمووومانە. بەڵام ناوی کویسنجق کەم هاتوە.

بۆیەش ئێمە ئەو باسەمان لەم پەرتووکە دەرهێناو تیشکی رووناکیمان خستە سەر، بە ئومێدی ئەوەی کە دەرگایەکی گچکە بۆ مێژوو نووس و رەخنە گرەکانی هونەر بکاتەوەو باس و لێکۆڵینەوەی نایابی لە سەر بنووسن.

# گۆرانی میللی کوردی

گۆرانی میللی هەموو گەلێك زادەی هزری کۆمەڵی خۆیەتی، ئاوێنەی بێگەردی ئەم سەردەم و رۆژگارەیە کە پیایا تێدەپەڕێ، رووی گەش و بێ پەرەی داخوازی‌یە سەرەتاکانی مرۆڤە بەرامبەر شتە ئاستەمەکان، ناسنامەو جوانکاری ئەم قۆناغەیە کەمۆرك و شقڵی رەسەنایەتی خۆی چەسپاندووە بیرو ئەندێشەی جۆرە کەسانێکە کە لە هەڵس و کەوتا سادەن بەڵام لە ناوەوە گەورەن، جگە لەمانەش تۆمارێکی دەماو دەمی کارەسات و رووداو مێژوویەکانی گەلەکەیەتی.

احمد حەیران

بەم چەند دێرە دەچینە ناو دنیای فراوانی گۆرانی میللی، ئەوەی راستیش بێ تاودکو ئێستا نەك هەر لە تورو ویژەی کوردی بەڵکو لای نەتەوەکانی تری جیهانیش پێناسەیەکی دەقاو دەق بۆ ئەم جۆرە بەشەی ئەدەبی فۆلکلوری دانەنراوە، بۆیە ئێمەش بەپێی توانا هەوڵ دەدەین چەند پێناسێکی بۆ بکەین.

ئەلیکساندەر کراپ بەم جۆرە پێناسی گۆرانی میللی The FolK Song دەکات دەڵێ: هۆزانە چامەیەکی ئاوازداری بنەچە بزرە لە نێوان خەڵکی نەخوێندەوار لە سەردەمێکی زوو بڵاوبۆتەوە تا ئێستاش لە کارنەکەوتووەو زیندووە.

بولیکافسکی دەڵێ: گۆرانی میللی ئەو گۆرانیەیە کە گەل دروست کەریەتی نەك ئەو گۆرانیە کە لە کەش و هەوایەکی میللی دەژی‌و بڵاوبۆتەوە.

هانزموزر دەڵێ: ئەم گۆرانیەیە کە میللەت بە گوێرەی ئارەزووەکانی گۆرانکاری تیادا کردووە دووای ئەوەی کە بە تەواوی بووەتە خاوەنی. پێناسەی تر هەیە دەڵێ: مەرج نی‌یە گۆرانی میللی گەل دروستی کردبێ. بەڵکو گەل دمێڵێ کە ئەو ئەرك و فەرمانانە بەجێ‌دێنی کۆمەڵانی خەڵك پێویستیانە).

هەشە دەڵێ: ئەم گۆرانیەی لە کۆمەڵە سادەو میللی‌یەکان باودو ماوە هۆزان و مۆسیقای کۆمەڵە گوندیەکان دەگرێتەود، کە ددماودەم بەشێوەیەکی سەر زاری دەگوزرێتەوە بێ‌وەی پێویست بکات بنوسرێتەوە). کەواتە ئەگەر لە رێگای ئەم هەموو پێناسە زۆرەوە لای ئێمەی کوردیش پێناسەیەکی تەواوی بۆ دانەنرابێ یاخود نەکرابێ ئەوە شتێکی زۆر ئاسایی‌یە، چونکە هەروەك زانراوە قسەکردن لەسەر گۆرانی میللی قسەکردنێکی فرە لایەنەو بۆیە هەندێ لە توێژەران گۆرانی میللی بە یەکێك لە گەورەترین مەتەڵی تاقیکردنەودی مرۆڤایەتی دادەنێن، چونکە کاتێ گۆرانی سەری هەڵداوە مرۆڤ لە سەرەتای تاقیکردنەوەی ژیاندا بووە، کاری گران هەڵوێستی سەخت لادانی باری پر لە ناخۆشی و جەوروستەم، ئەمانە گشتیان بە گۆرانی رێگای دەربازبوون وەیا چارەکردنیان بۆ دۆزاودتەوە.

ئەگەر واش نەبێ ئەوا توانیویانە ئەو بارە پر لەشەکەت و زەنەك و هەورازو هەڵدێرەی رۆژگار بە گۆرانی بقەتێنن.

**سەرەتاکانی پەیدابوونی گۆرانی میللی:-**

هەروەك دیارە گۆرانی ووشەو ئاوازە، وەدەنگە کەواتە دەبێ گۆرانی لەم قۆناغە پەیدا بووبێ کە ئادەمیزاد فێرە قسەبووەو زمانی تێك گەیشتنی بەکار هێناوە.

زۆر لە توێژەرانیش وادەبینن مرۆڤ لە زۆر کۆنەوە هەستی بە چێژی تەپل و رەزم کردووەو هەڵساوە بەپێش خستنی بانگە بانگ و خوێندن و هەڵبەزو دابەزی ئاژەڵ، تاکردونەتیە گۆرانیو هەڵپەرکێ، رەنگە پێش ئەوەی فێرە قسەش بووبێ وەکو ئاژەڵ بانگی دابێ، هەڵیش پەریـوەکـاتێ گۆرانی چریوە. هەندێکی تریش وا دادەنێن سەرهەڵدانی گۆرانی دەگەرێتەوە بۆ پێشینی مرۆڤی سەرەتایی لە تیۆروژاندن و کارتێکردنی دەنگی مرۆڤ لەسەر ئاژەلان و درێژەدانی ئەو پێشبینیەشە کەوا بزانرێ ئەو دەنگـە کار لە دیـاردەی تریش دەکات، جگە لەوەش زۆربەی گۆرانیـە میللیـەکان باسی دڵداریو شەرو شۆرو کارکردن و بیروباوەری ئاینی دەکەن.

لەگـەڵ زۆر لایـەنیتـر ئەمانەش هەریەکە پەیوەندی بەهۆی هاتنـەکـایـانـەوە هەیە رەنگە لە قۆناغێك بۆ یەکێکی تر پەیدا بووبن، بۆ نموونە هەندێ توێژەران گۆرانی دڵداری بەکۆنترین جۆری گۆرانی دادەنـێن، کەواتـە ئەمە دەبێ دووای قۆناغی ناوکۆیی سەرەتایی بێت، چونکە لەم قۆناغە جیاوازی لە نێوان رەگەزی نێرومێ نەبووە، بەڵکو بەیەکەوە هەوڵیان داوە بۆ خۆراك و گوزەران بۆیـە دەبێ گۆرانی دڵداری لە دووای ئەم قۆناغە هاتبێت. ئاراوە، چونکە پیاو و ژن ئەم سەربەستیەی جارانیان نەمـا بەم شێـوە هەرەمـەکیـە تێکـەلاوی یەکتـربن، بەڵکـو، بەربـەستیـك دروست بوو لە ئەنجـامی ئەمـەش تێنـویـەتی زایەندەیی (سێکسی) هاتەکایەوە وەکو جاران نەتوانن یەکتر تێر بکـەن لەمـەوەش ناچـار بوون بەگۆرانی هەڵبەست کۆڵی دڵی خۆیان دابرێژن، بەلام نابێ ئەم رایە بەقسەیەکی رەها بزانین چونکە تیۆری تر هەیە باسی گۆرانی دڵداری ناکا بەڵکو لە نێوان گۆرانی کارو گۆرانی ئاینی یەکێك بە سەرەتا دادەنێن، لەمانە هەنـدێـك گۆرانی کار بە سەرەتـا دادەنێن ئەمیش بەوەی کە دیمەنی بەکۆمەڵ بوون شەقڵی دیاری فۆلکلۆرە، گۆرانی کاریش زۆربەی بە کۆمەڵ دەگوترێن و دەگێردرێتەوە.

نمـوونەش بۆ ئەمە گۆرانی دروێنەیە، لەپاڵ ئەمانەشدا دەبێ ئەوە بزانـین گۆرانی تری ئیش کردن هەیـە بەتـاکـە کەس دەگوترێ وەکو گۆرانیی شوان، هەندێکی تریش لەم باوەرەن گۆرانی ئاینی کۆنترە چونکە ئەمیش شەقڵی بەکۆمەڵ وتنی پێوە دیـارەو لەکـاتی چرینیشیـا لەش پتـر دەجـولێتـەوە، بەلام بزافتنەکەی زادەی پەیڤ و بیرە ئاینەکەیە کەچی لە گۆرانی کار ووشەو هزرەکە زادەی ئیش کردن و لەش جولانەوەیەکە، لەم گۆرانیە ئاینیە کوردیانەی کە زۆر کۆن وەکو (هۆرە) کە رەنگە تایبـەتی بوبێت بۆ ستـایشی (ئـاهـورامـازدا) یا هیـچ نەبێ سەرچاوەکەی یەکێك بێت لە گۆرانییە دینیە کۆنەکان.

**جۆرەکانی گۆرانی میللی:**

لەبەر ئەوەی گۆرانی میللی چرترین و کۆنترین بەشە لە ویژەو زۆری فۆلکلۆری بۆیـە دابەشکردن و پۆلێن کردنی جۆرەکانی کارێکی زۆر سانا نییە، ژمارەی جۆرەکانی میللی پەیوەستە بە ژمارەی بۆنەکانی، جیاوازی شێوەکانیشی بە جیاوازی ئەم چوار چێوەی تیایەتی بەندە، بۆ نموونە لیژنەی فۆلکلۆری ئێرلەندەی گۆرانی میللی پۆلێن دەکا بۆ (٢٥) جۆری جیاواز لەرووی ژانرو مەبەستەوە، بەلام ئاسانترین رێگا بۆ پۆلێن کردنی ئەوەیە کە گۆرانی میللی دابـەشکـەینـە سەردوو جۆری سەرەکی، ئەو گۆرانیانەی تایبەتە بە ئافرەتان، ئەو گۆرانیانەی پەیوەستە بە پیاوان.

**گۆرانیەکانی ئافرەتان:**

(لاواندنەوە، مەرگ و شیوەن، مەشکەژاندن، بالۆرێ، تەون و چنین، ئاوهێنان، دەستار، بووکانە یا پێش بارە)

**لاواندنـەوە:**

ئەمە تایبەتە بە منداڵ لە ناوەرۆکیشەوە سۆزو خۆشەویستی دایکـە بەرامبـەر بەرۆڵەکەی. دوو جۆریشی هەیە، یەکیان بۆ

ئەوەیــە منالەکەی خەوی لێبکەویت، ئەمەیان زۆربەی لایەنی ناخۆشیو ترس بەسەریا زاڵە.

جۆرەکــەی تریــان ئەمــەیە کە دایك منالەکەی هەڵدەپەرینێو شایی پێدەکا ئەمەش زۆربەی لایەنی خۆشی و شادی بەسەریا زاڵە. لەم لایەنەش دایك هەڵپەرینی منالەکە بەهەل دەزانێ بۆ ئەوەی چی لەناو دڵیایە لە سۆزو خۆشەویستی یاخود ئەم هیواو ئاواتــەی کە خەونی پێـوە دەبینێ بۆ دووا رۆژی مندالەکەی دەری دەبرێ. نموونەش لەسەر ئەم دوو جۆرە لایەنە،

رۆلە لای لایێ رۆلە لای لایێ
نیشم زۆر زۆرن لۆ خەوت نایێ

بەلام لەکاتی شایی و هەڵپەراندن.

لەبەرت مرم لە بۆیێ
زێرت دەگرم لە برۆیێ
دەتکەمە حاکمی کۆیێ
کورەکەم هەستا لە خەوێ
دەستی دایە جەرەوێ
دەرێ دایە ژنم دەوێ .

پێویستە ئەوەش بڵێن ئەگەر مندالەکە کچ بایە دایك بەهەمان شێوە چی لە دڵ بایە یاخود چی چاوەروان دەکرد بۆ دووا رۆژی کچەکەی دەری دەبری وەك،

بسکی سورە گرێ گرێ
نایدەمە حاکمی موسرێ
گەرمایە لەرێ دەمرێ

## گۆرانی مەرگ و شیوەن:-

بەیــەکێـك لە بەشە کۆنــەکانی هونراوەی میللی دادەنرێ، لە رووی سەرهەڵدانیش پەیوەستە بە رێوو رەسمی جەنازەییەوە، ئەم هزرو خەیاڵەی لەم جۆرە گۆرانیەدا هەیە زۆربەی ترسانە لە مردن، چونکە لایەنی خەیاڵ زیاتر بەسەر ئافرەتدا زاڵە، هەر بۆیــەش ئافــرەتــان لەم جۆرە گۆرانــیـیــە سەرپــشکن. لە بچـووکتـرین کۆمــەڵگـاو رێکخــراوە کۆمەلایەتیەکانیش ئەمە هەستی پێدەکرێ.

لە کوردەواریش ئەم لایەنە بەرچاوە بەزۆریش بۆ ئەم کەسانەیە کە لە تەمــەنێکی گەنجی کۆچی دووایی دەکــەن بە (جــوانــە مەرگیــان) ناو دەبــەن. یاخــود بۆ کەســانێك کە پلەو پایەکی کۆمــەلایەتی بەرزیان هەبێ. لە کۆنی کۆنەوە (کۆتەڵ) بۆ ئەم جۆرە کەســانــە رێــدەخــرا. گۆرانی شیوەنیش بەم جۆرەیە، ئافــرەتــان لەســەر شێــوەی بازنــە خردەبنــەوە چوارکەس لە ناوەراست لە خۆیان دەدەن یەك دووایش گۆرانی دەڵێن ئەوانی تریش لەسەر شێوەی ئاوازو رەدزمی گۆرانیەکە لەسنگی خۆیان دەدەن و گۆرانیەکە دەڵێنەوە وەك:

هێرێ لەو دیو لەو دیوان
دێن دەنگی تەنکە زیوان
کەلەش کەتە نە دیوان
مەکوژن بابێ هەتیوان
هێرێ ئەوهام نەدی قەت
روو بەرووبن عەشیرەت
خوایە بکرێ مەسلەحەت

## گۆرانی مەشکە -

کاتی بەیــانی ئافــرەتــان مەشکەیان دەژاند، لەگەل جۆنیەتی هەڵس و کەوت و جولانــەوەی ئەم کردارە گۆرانیــان دەگــوت. ئاوازی گۆرانیەکە بە جۆلانەکە بەندە ووشەکانیش پەیوەستە بە ئەنجامی کردارەکەو ئەم کەل و پەلانەی لەم کاردا بەکاردێ، زۆرجــار لە رێگــەی ئەم گۆرانیــانــەنە ئافرەت بێزاری خۆی دەردەبــری لە دەســت دەورووبــەرو ئەرکی گران و دیــاردە کۆمەلایەتیە نارێکەکان وەك:

| | |
|---|---|
| بژەن بژەن مەشکۆلە | نێشێ ئەم شان و قۆلە |
| کۆرپەم زۆر نەرم و نۆلـ | واخەو توود لەم چۆلە |
| مەشکم مەشکا مانگا قولە | دەنگی دەروا وەك زەنگولە |

یاخو دەڵێ:

خەسوم عەمری نەمێنێ
لە هەیوانم دەنوێنێ
ئاوی مەشکێم پێ دێنێ

### بالۆرێ:-

ئەمە تایبەت بەکچانی تازە عازەبە کاتێ دەچوونە دەرەوەی ئاوایی بۆ کوڵەدار یا بەرخ لەوەڕان یا کەنگل و کاردی بەتایبەت بەهاران، دووان دەکەوتنە بەرامبەر یەك زۆرجار وابوو توانج و پلاریان لەیەك دەدا، یان کەم و کوری یەکیان دەردەخست زۆر کەرەتیش بە یەکتریان هەڵدەداو هیوای دووا رۆژیان دەردەبری. وەك:

بالۆرێ بالۆرێ بالۆرێ
لەسەر بەردە رەشێ
کەزیان لۆ خۆ بەخشێ
ناکەم کاکە رەشێ

### دەستار:-

کارێکە تایبەت بە ئافرەتان دەگەرێتەوە سەردەمی چاخە بەردینەکان گوریسێکیان وەکو بازنە دادەنا دەستارەکەیان دەخستە سەر ئینجا دوو ئافرەت بەرامبەر یەك دادەنیشتن یەکێك بە کوڵان دانەوێڵەی تێدەکردو گۆرانی دەگوت ئەوی تریش دەیگێرا، بەم جۆرە کاتی ئیش کردنەکەیان زوو بەسەر دەچوو زۆر هەستیشیان بەماندوێتی نەدەکرد. وەك:

دەی دلۆ دلۆ دلۆ　　چاڤێ رەش تژی کلۆ
دەی دلۆ یەمان دلۆ　　چاڤ رەشترن یان برۆ

### بووکانە:

یەکێکە لەم گۆرانیانەی کە بە کۆمەڵ دەگوترێ، کاتێ بووك دادەبەزی کچ و کار دەوریان دەدا، دەیانخستە سەرشوێنێکی بلند ئالایان لەسەر لادەبرد بە تلیلی و گۆرانی یەکێك دەیگوت ئەوانی تریش دەیانگوتەوە، گۆرانیەکەش بەزۆری باسی خۆشی بەیەك گەیشتنی بوك و زاوای دەکرد، لەگەڵ پیرۆزبایی وهاتنە دی مەبەستەکانیان، کچان ئەم جۆرە بۆنەیان بەفرسەت دەزانی بۆدەربرینی مەبەستەکانی ناخیان. نموونە لەسەر ئەم لایەنە:-

بە بەردە بە بەردە　　زوورگە زراو بە بەردە
گەردەن سوسنێ زەردە　　پیرۆزت بێ پەردە

٦

### گۆرانی تەون و چنین:-

ئەمە لەوانەیە شوێنی یەکەم گۆرانی کاربگرێتەوە بەمانای ئەوەی ئاوازو رەزمەکەی لەگەڵ رەزمی پیشەکە دەروا کە کارێکی دیاریکراوە. ئەم رۆژگارەش دەگوترا کە ئەم جۆرە پیشەیە یەکێك بوو لە پێویستیەکانی ناوماڵ کە هەمووشی دەکەوتە سەر ئافرەت و خانم و کچانی ماڵەوە.

تاوەکو ئێستا لەسەر چاوە فۆلکلۆریەکان گۆرانیەك نەکەوتۆتە بەرچاوم بەم ناوە تۆمار کرابێ بەلام دڵنیاشین هەیە زۆریش پێدەچێ لە کاتی پشودان و حەسانەوەی ئەم جۆرە کارە بگوترێ.

### ئاوهێنان:

لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان یاخود دواکەوتووەکان ئاو لە بیر یاخود کاتێ کە ژنان پێی هەڵدەستان بە کوندە یا جەرە بە گوێرەی رۆژگار کەرەسەکان گۆراون دەهات، جگە لەمەش ئەم جۆرە شوێنانە شوێنی بەیەك گەیشتنی هەردوو رەگەزی کورو کچ بووە، بۆ دیتن و یا پەیمان و بەڵێن دان، ئەم جۆرە ئاو هێنانە تا ئێستاش لە کوندەکانی خۆمان ماوەبەلام لە کوردەواری زۆر بەیتە گۆرانی هەیە باسی رێگای کانیو خۆشەویستیو دڵداری دەکات بۆیە دەبێ هەواو ناوەرۆکەکەی هەر لەم هامو شۆیە هاتبێ.

ئەگەر کچ حە زکا دۆستی ببینی
جەرە هەڵدەگری ئاو لە دوور دینی

### گۆرانی پیاوان:

هەروەك چۆن چەند گۆرانیەك تایبەت بە ئافرەتانە ئاوهاش چەندان گۆرانی هەیە پەیوەستە بە پیاوان، گۆرانیەکانی پیاوانیش چەند جۆرێکن وەکو راو، دروێنە، داوەت، ساوار کوتان، تارمە، رەوسە برکردن، شوان ...هتد، هەریەکەش لەمانە بەگوێرەی پێویستیەتی ژیان وسەردەم و رۆژگاری پەیدا بوونی رۆڵی خۆی لە بنیاتی ژیانی کۆمەڵ بینیوە، خاسیەتی بەکۆمەڵ

وتن لەسەر زۆربەی گۆرانیەکانی پیاوان دیارە ، هەریەکەش لە ناوەرۆك پەیوەستە بە خودی کارەکەو رەنگ دانەوەی پێویستەکانی ژیان و رۆژگار.

**سترانی راو:**

راو خولیاو ئارەزوێکە چەند کەسانێك پێیەوە پەیوەستن، وەکو چەندان کارو پیشەی تر. خوێکە مرۆڤ دەیگرێ بۆیە پێناچێ ئەم کارە لەبنەرەت تایبەت بەدەستەو تاقمێك بێ، راویش چەندان جۆری هەیە هەریەکەش کەرەسەو تاخم و تەدارەکی خۆی گەرەکە، خۆشترین و دیارترین راو راوی ئاسك و کەروێشکە. پەیڤ و ناوەرۆکی هەڵبەستەکانی سەربەم لایەنە زۆربەی رەنگدانەوەی ئەم کارو کردەوەیە.

هەراوە راوە راوە کاکە چ رەشە راوە
ئەسپان زین و لغاو کەن تاژیان مامز گیراوە
شینکەکی ناوقەد باریك لە نواران پاری داوە
گەزەنگی رۆژ ی لێدا کەلەکەی وەرگێراوە
درم نەهات چی پێ بریم لەدیاری پارم داوە

**گۆرانی دروێنە:**

دروێنە کارێکی بەکۆمەڵەو لەسەردەمی کۆمەڵی کشتوکاڵیو ئاژەڵداری ئەوپەری باوی بووە، کاتێك سەپانەکان دەچوونە گازێو بەرە دروێنەیان دادەنا یەکێك گۆرانی دەگوت ئەوانی تریش دەیانگێراوە، ئاوازی گۆرانیەکە لەگەڵ بزووتنەوەی دەست و قاچی سەپانەکان بەتەواوی لەسەر رەزم و دەرۆی، وشەو ناوەرۆکی ئەم گۆرانیە مەرج نییە تەواو پەیوەست بەم کارو پیشەیە بێت، بەڵکو پەل و پۆی بۆ زۆر لایەنی تر هاویشتووە، وەکو بێزاری لە دەست رۆژگار، خۆشەویستیو خەفەتباری و هەوڵدان بۆ چاك بوونی باری ژیان، بەنابردنە بەرخوا بۆ کەم کردنەوەی باری قورسی گوزەران یا دەست نیشان کردن بۆ هەندێ بەندو باوی کۆمەڵایەتی نا بەرابەر:
پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەم جۆرە شتانە سیمای سەرەکی زۆربەی گۆرانیەکانی کارن نەك لە کوردی بەڵکو لای زۆربەی خەڵکی گۆی زەوی. نموونەش لەسەر ئەم جۆرە لایەنانە لە گۆرانی دروێنە.

ئاو گەییە مرێبان      زرینگە زرینگی رکێبان
مەلا برۆننە کتێبان      بەژنی باریك مندالە
مەییەنە سەر حسێبان

یاخود دەڵێ:ـ

وەز قاسیدم قاسیدم سبەی دەرۆمبەیانی
کارکو گۆریەم |لە پێکرد هەرم کێشاینە رانی
قاقەزی یارێم پێیە دەچمە دەرکەی سوڵتانی
ئەگەر سوڵتان نەی پرسی دەچمە گاورستانی
بەرێ خۆم لە چۆلیان کرد پشتدەد... عوربانی

جگە لەمانەش زۆر جار ئەم تەرزە گۆرانیانە لەم شتانەش تێدەپەرێنێ، پەنا دەباتە بەر پێش بینیو تێرامان بەرامبەرئەم گەردوون و رۆژگارو سروشتە. لە چۆنیەتی دروست بونیاو دۆشدامان (تحیر) بەرامبەریا. وەکو:

هانام بەبەر خالقی      هەزارو یەکی ناوە
عاسمانەکی بەرز بێ      چلەو ئەستون وەستاوە
بەشەو تاریك و نوتەك      بەرۆژ خۆرو هەتاوە
لەجێ جێ ووشك ودێمە      ی جێ بەحرو ئاوە

بێگومان ئەم جۆرە شتانە بیرکردنەوەو فەلسەفەی مرۆڤی سەرەتایین، بنەرەتێکی لۆژیکانەشە بۆ سەرهەڵدانی ئەم جۆرە لایەنانە

**سترانی شاییو گۆڤەند:ـ**

شایی و دیلان لە کوردەواری زۆر جۆری هەیە، هەرجۆرەش بە گوێرەی بزوتنەوەو چالاکیو هەڵس و کەوتی سەما کەران دەگۆرێ، سروشت و هەڵس و کەوتی ناوچەگەریو بوونی دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیاواز لە زمانی کوردی وایکردووە ناوی جۆری سەماو هەڵپەرکێکان زۆر مشە بن، بۆیە دەتوانین بڵێین دەیان و سەدان جۆر هەڵپەرکێی جیاواز لە کوردەواری هەیە.
ناوەرۆکی ئەم جۆرە سترانانەش پەیوەستە بە ناوەکەیەوە رەشبینیو غەم و پەژارەیی کەم تیادا بەدی دەکرێ.

ئەز بەفرا چیاکێ سۆرم      لێ لێ نار، لێ لێ نار
حەمایلۆکا ب مۆرم      لێ لێ نار، لێ لێ نار
ئەزیا لاوکێ پسپۆرم      لێ لێ نار، لێ لێ نار
ئەزیا لاوکێ پسپۆرم      ناری توو دەلالی

**گۆرانی ساوار کوتانەوە:-**
ساوار یەکێکە لە بەرهەمەکانی کشتوکاڵ، رەشگوڵ دووای کوڵان ووشک دەکرێتەوە، پاش ئەمەش پێویستی بە کوتانەوە هەیە تا ئەوەی توێکڵەکەی فڕێ بدرێو ئامادەبێ بۆ هارین، **پێش داهاتنی ئاشی ئاو یاخود کارەبا هارین بە دەستار بوو، لە کاتی ساوار کوتانەوە دووسێ کەس کوتکیان دەوەشاند لەسەر ئاوازو رەزمێکی تایبەت کە پەیوەستە بە جوڵانەوەی ئەم کردارە لە چوار دەوری قوڕتی ساوارەکە دەسوڕان** و گۆرانیان دەگوت، **ناوەڕۆکی گۆرانیەکەش پەیوەستە** بەم کردارەو دڵداری **وخۆشەویستی و جوانی ئافرەت.**
زۆر جاریش لە ڕێگای ئەم گۆرانیەوە کوروکاڵ نیازی دڵی خۆیان دەر دەبری‌و ئەم جۆرە کارانەیان بە هەلێك دەزانی بۆ کردنەوەی بوخچەی دڵیان بەرامبەر ئەم هەموو شتەی کە پەنگی تیادا خواردوتەوە. بەڵام بە ڕێگایەك خواردوتەوە، بەڵام بە ڕێگایەك خواست و ویستەکانیان دەردەبری کە لە داب و نەریت بە دەرنەبێ.

**کەزی خانێم بیست و دووە**
**لسەر ملان هات و چووە**
هەستە خانێ رووم لەتووە
مەردقی کیژ هەردەم شووە

یاخود:-

هەروا دەروا لۆ سەربیرێ
چاروك مەرزەی چوشتیرێ
یاخوا ئێرە بەقوری گیرێ
بەدکار زۆرن دۆست ناگیرێ

**گۆرانی رەوسە برکردن:-**
خەرمان دووای کوتان شەن و کەوەدەکرێ کاو دانەوێڵەکە لێك جیادەبێتەوە بە دانەوێڵەکە دەڵێن (رەوسە) چ گەنم بێ چ جۆ، ئەمە دەبایە بەش بەش بکرێ واتە بر بر بۆ ئەوەی بەشی ئاغاو سەپان و زەکاتی تێدا دەربکەوێ، گەنم دەکرایە (٦) بەش جۆ دەکرایە (٥) بەش ئەم دابەشکردنەش بە بێژینگ یا سەرەند یا هەرئامانێکی تر دەکرا، لەم بەشانە یەکێکیان بە (ربە) دەپێوا لەمەوە بۆیان دەردەکەوێت رەوسەکە چەندی کردووە ئینجا لیرەوە بەشی ئاغاو سەپان و زەکات دیاردەکەوت. ئینجا لەکاتی ئەم بەشکردنە یەکێك خۆی دەکردە سەرپاڵەی رەوسە برکردن بە ئاوازو دەنگ لەگەڵ هەڵسان و دانیشتنکەی سەپانەکان چەند قسەیەکی جوان و رێك و پێکی ئاینی بەکەڵك و فەراموشی دەکرد. قسەکانیش بەژمارەیە، لەیەکەوە تاوەکو (زیادە) سێزدە دەروا هەمووشی جوێن بە شەیتان و ناوهێنانی خواو پێغەمبەرە بۆ ئەوەی بەرەکەت بکەوێتە رەوسەکە، بۆ نموونە لە ژمارە (سێ)دا دەڵێن:-
ئەوە سێ:

**بەرەکەت کەویتە وی رەوسێ**
**یا شێخەکەی ماڵ لە قدووسێ**
**خوا بدا پێغمبەر بنووسێ**
**چاوی چاو پیسان بنووسێ**

ئەمانە بەشێکی دیارو بەرچاوی گۆرانی میللی کوردی بوون لای ئافرەت و پیاو. بەڵام ناتوانین بەسەرەتاو کۆتاییان دابنێن چونکە بە گوێرەی سروشت و رێ و رەسم و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی‌و کاروپیشە میللیەکانی ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستان زۆر گۆرانی‌تر هەیە، بۆ نموونە گۆرانی (تارمە) لە کاتی خەرمان تەواو دەکوترێ‌و کۆدەکرێتەوە بۆشەن و کەوکردن پیاوان دەیڵێن، یاخود لەهەندێ ناوچە نیسك و نۆك دەچێنرێ لەوانەیە لەکاتی دروێنەیان گۆرانی تایبەت بەم لایەنە هەبێ، یان تۆوکردن، یا کاتێك باران نابارێ مەلا و چەند کەسێکی دیار دەچن پەلووکە بەرد داوێنە ناو بیرێکی کۆن بۆ دوعای باران بارین، یا گۆرانی بیری‌کاتێ بێروانەکان دەچنە مەر دۆشین دەگوترێ، یا شەوتا، جگە لە گۆرانی ئاینی کە پیاوو ژن دەڵێن وەکو سەلاوات و گۆرانی دەرۆزەکەران.. بەکورتی جۆری گۆرانیەکان لە جۆری بۆنەکانیان دەردەکەوێ..

### سیماو ناوەڕۆکی گۆرانی میللی:
هەروەك زانراوە گۆرانی میللی بەشێکی گرنگە لە ئەدەبی فۆلکلۆری، لەم جۆرانەی کە باسیشمان کرد لەوانەیە ناوەڕۆك و سیمای گۆرانی بۆمان دیار بکەوێ. گۆرانی کوردیش بەشێکی گرنگی کەلەپووری کوردیە بۆیە زۆربەی ناوەڕۆك و مەبەستەکان پەیوەستە بەرۆژگارو باری ژیان و گوزەرانی ئەم گەلە.

که وه‌کو ده‌سکه‌لایه‌ك گوزاره‌ی پێ له‌خۆو بیرو راو ئاوات
به‌بەست و خوو ره‌وشه‌کانی کردووه له‌م رووه‌وه ئه‌وه ده‌رده‌که‌وێ
که گۆرانی میللی بێ ناوه‌رۆك نی‌یه وه‌کو هه‌ندێ که‌س
واتێده‌گه‌ن، به‌ڵکو له زۆر لای کێشه‌کانی کۆمه‌ڵ نزیك بۆته‌وه،
به‌شێوه‌یه‌کی سه‌ره‌کی پێگه‌و شوێنی گۆرانی میللی له‌ناو کۆمه‌ڵ
ئه‌و فه‌رمان و داواکاریانه‌یه که گۆرانی میللی ده‌یان هێنێته‌دیو
گوزارشت له‌خواست و ویسته‌کان ده‌کات، بۆ نموونه یا زه‌ینی
ئه‌م تاقه دێره پده‌ین که چۆن مه‌به‌ست و فه‌لسه‌فه‌یه‌کی گه‌وره
به‌شێوازێکی زۆر ساده‌و ناوه‌رۆکێکی گرانبه‌ها ده‌رده‌برێ.

خۆزگه‌م به‌سالآن له‌گه‌ڵ رۆژگاران
ته‌فره‌قه نه‌بوون چۆن گه‌لآی داران

گۆرانی میللی له فۆرم و ناواخندا زمان و بیری پانتاییه‌کی
گه‌وره‌ی کۆمه‌لآنی خه‌ڵکه، بۆیه به خوله‌کانی ژیانی مرۆڤ و
داب و نه‌ریت و کاتی خۆشی و ناخۆشی به‌ستراوه‌ته‌وه. هه‌روه‌ها
بۆ خه‌ڵك به ئه‌رکی زه‌مانه‌ی هێمنی هێوری له‌کاتی ئه‌وپه‌ری
ته‌نگه‌تاوی هه‌ڵده‌ستێ، جگه له‌مه‌ش رێگایه‌که له رێگاکانی
خۆشی و شادی بۆ ئه‌نجام دانی کاری گران و هه‌ناسه دانه‌وه‌ی
هه‌ست و سۆزیان، له‌م ده‌لاقه‌یه‌وه به‌ده‌یان تابلۆی جوان
دیمه‌نی خۆبه‌خت کردنی قه‌شه‌نگ له گۆرانی کوردیدا ده‌بیبنین
که خۆی له خۆیا ئه‌و په‌ری په‌یامداریو خۆبه‌ستنه‌وه‌یه
به‌کێشه‌یه‌ك که قوربانی گه‌ره‌که، له‌ناو ده‌یان نموونه‌ی له‌م
بابه‌ته ئه‌م چه‌ند دێره‌ی به‌یتی (حه‌سه‌ن) ده‌که‌ینه به‌رکوت که
سه‌ر له‌به‌ری به‌یته‌که کۆنترۆڵی خۆنه‌ویستی هاواری ده‌نگی
توره‌یی و بێزاری‌یه له ده‌ست دام و ده‌زگاو دیارده ناته‌باو
ده‌ست کرده‌کان، جگه له‌مه‌ش هه‌ستی غوربه‌تیو
خۆشه‌ویستی گه‌ردو تۆزی نیشتمانی تیادا ده‌بینرێ،
نموونه‌یه‌ك له به‌یته‌که:

چه‌ندم گۆ کوره حه‌سه‌ن — مه‌که خزمه‌تی میری
سه‌رێ خۆمان هه‌ربگرین — بچینه وراتی جزیری
شا که زیانت لۆ ببرم — بیکه به‌ندوکی شیری
چ غیره‌ت بوو له بۆ تۆو — یاریان برد به‌یه‌خسیری
له وو‌راتی غه‌ریبیان — تامنت بێته‌وه بیری

گۆرانی کوردی له هه‌ندێ جیگه‌ش دا وه‌کو گه‌نجینه‌یه‌که بۆ
شوێنه‌وار زیندوکردنه‌وه‌و به‌سه‌ر کردنه‌وه‌ی ده‌یان گوندوو شار
هه‌ریه‌ك له‌مانه‌ش نیشانه‌ی شتێکه، له زۆر جێگادا باسی
رۆژگاری بونی شارستانیه‌ت و کۆنیه‌تی ئه‌م شارو جێگایانه
ده‌کات، فره ده‌رکه‌وتنی ناوی گوندو شاره دێرین و مێژووییه‌کان
له ئه‌ده‌بی سه‌رزاری ئه‌گه‌ر به‌خاسیه‌تێکی سروشتی فۆلکلۆر
دابنرێ، ئه‌وا له خۆشیدا په‌یوه‌ست و به‌ند بوونی مرۆڤه به
خۆشه‌ویستی ئاخ و سروشت و خاك و خۆڵی نه‌وه‌دو
نیشتمانه‌که‌ی بۆ نموونه دیار به‌کرو قامیشلی و ماردین که
هه‌ریه‌که‌یان به یه‌کێك له‌شاره کۆن و خاوه‌ن مێژوویی‌یه‌کانی
کورد داده‌نرێن چۆن چوونه‌ته ناو گۆرانیو هونه‌ری میللی:

دیار به‌کر ب ده‌رگه‌یه — قامیشلوب حه‌واله‌یه
گر حه‌رین یێ ب باخچه‌یه — ئه‌سکی ڤێ متاوه‌ره‌یه
مدیاده ب شیاکه‌یه — مێردینێ ب قشله‌یه
مه‌سکه‌نێ من و ته‌یه — من و نازێ دل هه‌یه

هه‌روه‌ها گۆرانی کوردی له‌پاڵ لایه‌نی‌یه بێزاریو ئاسته‌نگیه‌کان
لایه‌نی خۆشه‌ویستیو دڵداریش ناوه‌رۆکی زۆربه‌ی گۆرانیه
میللی‌یه‌کانمانه. له‌م روه‌ش تاراده‌یه‌کی زۆر دڵسۆزیه‌کی له راده
به‌ده‌ر به‌رامبه‌ر به‌م کێشه‌یه ده‌رده‌که‌وێ په‌یوه‌ست بونیشه
پێیه‌وه تا دووا هه‌ناسه.
ئه‌مه‌ش نموونه‌ی وه‌فاداریو بێ وێنه‌یی به‌جه‌رگیه له‌م مه‌یدانه.

که‌وێی به‌ری داغی مۆره — له‌سه‌رم دا پاشای کۆره
ده‌ست هه‌ڵناگرم له گوڵه سۆره

ده‌رکه‌وتنی پاشای کۆره‌ش لێره‌دا ده‌ست نیشانێکه بۆ رۆژگاری
سه‌ربه‌خۆیی ئه‌ماره‌تی سۆران و بوونی دام و ده‌زگاو
[illegible] دوایییه‌کی خۆمانه‌ خۆشه‌ویستیو شانازی کردن به‌م
ئه‌ماره‌ته **له‌لایه‌ن خه‌ڵکه‌وه.** له‌پاڵ ئه‌مه‌ش **گۆرانی دڵداریو**
خۆشه‌ویستی ئه‌گه‌ر له‌خۆیا هه‌ستێکی قوڵ و سیو ڕێنی
ساکاره، به‌لآم یه‌کسانی و مرۆڤایه‌تیشی تیایه، جوانی دڵداریش
هه‌ر بۆ خاوه‌ن ده‌سه‌لآت و سه‌رمایه‌داران نی‌یه، زێرو پاره‌و پول
هیچ له‌سه‌نگی ئافره‌ت زیاد ناکات، هه‌موو ئه‌ڤیندارێکش خه‌ون
به‌م لایه‌نه‌وه نابینێ.

له كێم دیت و لەكێم دیت لەبانی گردە بۆری
دەرمانان لە خۆمەدە هێ كچێ لە خۆراسۆری
سەت برێن كیژە دۆمە لەكنەمن وابی حۆری

لە گۆرانی‌یـە میللی‌یـەكـان گەلێـك جار ئاماژە بۆ چیرۆك یان ئەفسانە، یاخود پاڵەوانی داستانە میللی‌یەكان دەكرێ، گۆرانی كوردیش لەبەر ئەوێ رەنگدانەوەی هەست و سۆزو رەشت و خوی كۆمەڵایەتی ئەم میللەتەیە لەم جۆرە لایەنە بە دەرنی‌یە (مەم و زین، قەلای دمدم، شیرن و فەرهاد، خدری زیندە).. هتـد دەردەكـەوێ، ئەمـەش رۆژ بە رۆژ لەگەل دینامیكیەتی مێژوودا هاتووە تا ئێستاش نەپساوەتەوە، بۆ نمونە ناوی زۆر لەسـەركـردەو پیـاوە چەلەنگـەكـانی رووداوە مێژویی‌یەكانی سەرەتای ئەم سەدەیە لە گۆرانی میللی رەنگی داوەتەوە، ئەوەتا شێـخ مەحمـودو كەریمی فەتـاح بەگ بەشێـوەیەكی فرەوان چوونەتە ناو لاوك و حەیران و گۆرانی میللی.
لێرە ئەوەشـمـان بۆ دەردەكـەوێ گۆرانـی میـللی چەكـێكی كاریگەریشە لە گۆرەپانی تێكۆشانی نەتەوایەتی‌دا،

بابی بابم شێخ مەحمود لەگەر دەزگای داتنایە
هەیبەت سولّتان برندە تۆپخانەی لێدانایە
كەریمی فەتاح بەكی عەسكەری تەعلیم دایە
عەسكەری شێخ مەحموودی سنجیتاق راوەستایە

بەشێوەیەكی گشتی ئەمانە تا رادەیەكی زۆر سیماو ناوەرۆكی گۆرانی كوردی بوو، هەرچـەندەش بەدوایدا بگەرێین كونج و كەلـەبـەری وردتر دەدۆزینەوە كە پەیوەندی ئەم شێوە ئەدەبە سەر زاریـە بە رۆژگـارو سەردەم و كات و شوێنی مێـژووی كوردەوە دەبـەستێتـەوە، لەهەمان كاتیش ئەگەر تورو وێژەی نوسراو وەكـو سەرخـانێـك رەنگـدانـەوەی باری ئابـوری‌و كۆمـەلایـەتی‌و رامیاری بووبێت، ئەوا ئەدەبی فۆلكلۆریش لە رێگای جۆرو رەگەزەكانی كە گۆرانی میللی بەشێكە تیای ئەوا ئەمیش پەیوەست بووە بە وردو درشتی ژیانی رۆژانەی كۆمەلّی كوردەواری‌و گوزارەی باری راستەكی دڵ و دەروونێكی سادەو بێ پێچ و پەناو گرێ كوێرەیە، بە بارتەقای لایەنە فرەوانەكانی ژیـانیشـەوە خزاوەتـە ناو هەموو تلیزە تەسك و تریسكەكانی سەرلەبەری دەستەو تاقمەكانی كۆمەڵەوە.

## لێ دەرو پەراوێزەكان


١ ـ الدكتور احمد مرسي، الاغنية الشعبية، المكتبة الثقافيه، العدد ٢٥٤، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر، ١٩٧٠ ل ، ١٠، ١٨، ٨٩، ٧٤
٢ ـ فوزى العنتيل، بين الفلكلور والثقافة الشعبيه، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٧٨، ل، ٢٤٧، ٢٤٨، ٢٤٩، ٢٦٣، ٢٦٤
٣ ـ لطفي الخوري، في علم التراث الشعبي، الموسوعة الصغيرة ٤٠، ل، ١٥، ١٧
٤ ـ دكتـور عیزەدین مستەفا رەسوول، لێكۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی زانكۆی سلێمانی، ل، ٨٤، ٨٥، ٨٩
٥ ـ محمـود زامـدار، دەروازەیـەك بۆ ئاوازو گۆرانی كوردی، دەزگـای رۆشنبیری‌و بلاوكردنەوەی كوردی، دارالحرية للطباعة، بەغدا ١٩٨٠، ل ٥٣
٦ ـ محـمـد كریـم شریـف، فۆلكـلۆری هۆنـراوەكـانـی كوردەواری، ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان، چاپی دووەم، لەچاپ دانەوەی سعدالله اسماعیل شێخانی، چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٨٦، ل ٤٣، ٥١، ٥٨، ٦٠، ٦٣، ١٠٤، ١٥٨
٧ ـ عومەر شێخەڵا دەشتەكی، داستان و گۆرانی لە فۆلكلۆری كوردیدا، بەرگی یەكـەم، چاپی یەكـەم، ئەمـانـەتی گشتی رۆشنبـیری و لاوان، چاپخانەی سەلاحەددین، هەولێر ١٩٧٨، ل ٩٩، ٧٨، ١١٠، ١١٥
٨ ـ سعـدالله اسمـاعیـل شێخانی، گوڵبژێرێك لە فۆلكلۆری كوردیدا، چاپخانەی، ارشاد، بەغدا، ١٩٨٥، ل ٤٨، ٥٥
٩ ـ هەردەوێـڵ كاكـەیی، هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلكلۆری كوردی ناوچـەی گەرمیان، بەرگی یەكەم، چاپخانەی حوادث، بەغداد ١٩٨٥ ل ٣٢، ٣٩، ٤٠
١٠ ـ ئاوازی ئەحـمـەدی حەمـەدەمینی دزەیی، فۆلكلۆری كوردی لە ناوچـەی دزەییاندا، ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان چاپخانەی الاديب البغدادية ١٩٨٥، ل ١٥، ١٧، ٨١
١١ ـ احمد عبدالله زەرو / خالد حسین یعقوب، سترانێت شاهی‌و دیلانا، كۆمەلائێكێ، ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان، چاپخانەی علاء، سالا ١٩٨٠، ل ٣٤، ٥٩
١٢ ـ داود محمد شرۆڵ، گۆڵمێـك لە رەوسـەی فۆلكلۆری كوردەواری، [illegible] ١٠ەتر گشتی رۆشنبیری و لاوان، چاپخانەی الحوادث، بغداد ١٩٨٧، ١٣٢

# پێناسینەك ل دور ژیانا پەزی

كامیران درباس هروری

شڤانەتی‌و خودان كرنا پەزی ژ كەڤندا دناڤ مللەتاندا یا هەی لەوا حەتا ئەڤروژی هەر ئەو كارو رەوشت یێن ماین ژ بەر هندێ زانایێن ئەنترو پولوجی‌و فولكلوری بهایەكێ گەلەك مەزن ددەنە ڤێ مەسەلێ ژ بو دیار كرن و ڤەكولینا ژین و ژیارا مللەتان (١) گوتن پێ نەڤێت مللەتێ كورد ژی ئێكە ژ وان مللەتان ئەوێن ژ كەڤنـدا ژین و ژیـارا وان سەر خودان كرنا تەرش و كەوالی. سەربارا فولكلورێ كوردی دا مشە كوردناس و روژ هەلات ناس و گەروَی دانە قەلەمی‌و ڤەجەماندن بەلێ رەوشەنبیرێن كورد ل سەرێ ڤی چەرخێ دەست ب كومكرن و بەلاڤكرنا فولكلوری كرن دەمێ گوڤارو روژنامێن كوردی هندەك پەندو گوتێن مەزنا بەلاڤ كرین وەك گوڤارا ژین ١٩١٨ز ، روناهی ١٩٤٢ ز. (٢)

براستی ئەم پێدڤی ڤەكولینێن فولكلوری نە بو دانانا بناغەكێ موكم بو زانستیـا ئەنثـرو پولوجیـا كوردی. بەلێ ڤەكـولینـێن فولكلوری بناوایەكێ زانستی كەس نەشێت بتنێ بكەت ژ بەر گەلەك ئەگەرا. لەوا ئەز دێ ل سەر بخودان كرنا پەزی ل دەڤەرا مە ئاخڤم كو بەردەواری بالانە وەكی ئێكە بەلكی ژ دەڤەرێ بو دەڤـەرێ‌و ژ گونـدی بو گوندی تێتە گهورین. ئەڤە ژی ژ بەر هندێیە كاودانێن وان نا خازن هندێ هەمی وەكی ئێك بخودان كەن ژ بەر بەفرو باران و سەرمایێ چونكی ل هەمی جها بەفرو باران هندی ئێك ناهێت یا نژی ژ بەر هندێ یە كو هەر جهەكی كارو رەوشتێن خویێن خومالی هەنە.

بەری من سەیدایێ هێژاو بها گران [عبدالرحمن نقشبندی] یال سەر ڤی بابەتی نڤێسی ل گوڤارا روشنبیری نوێ ژمارە [٨٥] سالا [١٩٨١] سەیدای بەحسێ پالینێ‌و هەفشی‌و كەر بارێ یێ كری‌و بەحسێ هنـدێ یێ كری كا چەوا مهـ و بزن دبرین كا چەنـد رەنگـێن بزن و مها هەنە دكرمانجیا ژێری‌و ژووری‌دا گەلەك ئێشێن وان یێن خویا كرین وەكی [كەچەل و گوری‌و ـ سیسكی باوشی...] براستی سەیدایێ عبدالرحمن بناوایەكێ گەلەك جوان و زانستی یێ لدویڤ چووی‌و یێن نڤێسینی بەلێ گوتارا من و یا وی پەیوەندی یا لگەلێك هەی بەلێ پا جودا هیەكا مەزن و ژی دێ دگەل ئێك هەبیت لەوا من بفەزانی ئەڤ بابەتە هێژ ب بەر فرهەی بێتە نڤێسین، مروڤ لدیڤ بچیت.

**أ ـ خودان كرنا پەزی لبا مە:**

ئەم دێ ژ وەرزێ پایزێ دەست پێ كین بهارێ هەر بیست سیهـ مال دا پەزێ خو كنە ناڤێك دگوتێ «كەر» ئان «بر»، پایزێ حەتا هەیڤا یازدە هەكە سالا خوش با حەتا هەیڤا دازدە دا پەزێ خو ژێك ڤەگرن، هەر ئێك دا چیت بەر یێ خو حەتا دنیا باش سار د بوو، ژویـرێ ویڤە دا ئالفی دنێ ئەوێ بهارێ‌و هاڤینێ بو كری، وەكی: چولی‌و هەلزێ‌و كەر كولێ دگـوتێ «مشتی» بەلێ زڤستانێ ژی بزن دچوونە چیا، میهـ دهێلان ل مال، چونكی میهـ وەكی بزنا نەدشیان خوەش بچن و بێن حەتا بهارێ پەز دزا ژویـرێ ویڤە پەزێ رەش و سپی پێگڤە دچو چیای، ئێڤارێ دادكر كولی ئان ددا هەفشی، حەتا بهار باش خوەش دبوو. ئەو مالێت خودان پەز دا چن چیا ب شەڤێ ژی نەدئینا مال ئەو مالێت كێم پەز هەی دا گەهەنێ حەتا دبو بر ئان كەر، ڤێجا بێری دا چنە بێرێ روژێ جارەكێ دا پەزی دوشن. جارەكێ دا بێچكا مێژینن هندە روژا دوو جا پەز ددوشت، هندەك روژا جارەكێ دا دوشن ڤە، جارەكێ د... ـیدی خەما شیری نینە. روژەك هەبی دگوتێ [بێ چو بێر] هندەكا دگوتێ [شیر بر] ئانكو ئێدی بێچكا نامێژینن هەرو پەزی دوو دانا دا دوشن. هەر ئێك دا بێچكەیت خو بتە مال دا ماتی ژێ كەت حەتا د فروتن ژ شیر برێ ویڤە دا بتە نوبانێ ل دویڤ ژمارا پەزی. پشتی بێرا دانـی ئێڤاری دكر دا پەزی راكن بن چیا حەتا دەم ژمـێر یازدەی شەڤێ دگـوتە ڤێ شیڤ، پشتی هینگێ دا دی هەفشی نێزیكی دوو دەم ژمێرا جارەكا دی دا راكن بن چەرێ...

دگـوته ڤێ شەڤین. جارەکا دی دائینن ڤە هەفشی حەتا بەرێ سپێدێ جارەکا دی دا راکن بن چەرینن حەتا دەم ژمێر نەهـ دەهی سپێـدێ دگـوته ڤێ تێشت. دا بێهنا وی نێزیکی دەم ژمێرەکێ ڤەکن حەتا شڤانا ژی تێشت دخار. دا راکن ئینن ئاڤێ دا بێرا دانێ سپێـدێ کن دا پەزی بن «مەخەلێ» ئان «پشت روژێ» حەتا دەم ژمێر دووی نیڤرو دا پەزی راکن بن پالینێ حەتا ئێڤاری جارەکا دی دا تینن سەر ئاڤێ دا بێرا دانێ ئێڤاری ژی دوشن. هاڤینێ دا چەند روژەکا نێریا ژ پەزی ڤەگرن دا بزن زوی نەئێن نێری حەتا زانی دێ پشتی زیپەی زێن ژنویکا دا نێریا بەردەنێ حەتا نێزیکی هەیڤا دەهـ دا پەزی ئێك دان کەن حەتا پایزی جارەکا دی دا پەزی ژێك ڤەگرن هەر ئێك دا چیت بەر یێ خو.

بڤی رەنگی پەز ل دەڤ مە دهاتە بخودان کرن، بەلێ ل گەلەك گونـدا وەکی مە نە ب خودان دکـر چونکی عەردێ وان نەی هاریکار بو چێنەد بوو کەس ب سەر ئاخا کەسێ ڤە بچیت.

**ب ـ ناڤێن پەزی د کرمانجیا ژووریدا**

أ ـ پەزێ رەش [بزن]

١ ـ کر ـ ئەو بزنە یا گوهێن وێ دبچویك.

٢ ـ کال ـ ئەو بزنە یا گوهێن وێ سەر سوریڤە بن نە خاسمە بنێ گوهێ وان.

٣ ـ گورد ـ ئەو بزنە یا بنێ کوریا وێ سپی ئان سور بیت دبێژن ئەڤ بزنە گوردە سورە ئان گوردە سپی یە.

٤ ـ کوچ ـ ئەو بزنە یا بێ شاخ.

٥ ـ کەلاس ـ ئەو بزنە یا شاخ چیخن.

٦ ـ پوش ـ ئەو بزنە یا گوهێن وێ چنیکێن سپی لێ بن.

٧ ـ بەل ـ ئەو بزنە یا گوهێن وێ لویلی بن ئان رەپ بن.

٨ ـ کەڤەر ـ ئەو بزنە یا نیڤەك رەش و نیڤەك سپی.

٩ ـ سیسن ـ ئەو بزنە یا ناڤ چاڤ و گوهـ سپی.

١٠ ـ همبس ـ ئەو بزنە یا ناڤ چاڤ سپی.

١١ ـ قلوز ـ قلـیچ ـ ئەو بزنە یا شاخێن وێ پیچەکێ د خار ب نك گوها ڤە.

١٢ ـ بازن ـ ئەو بزنە یا خەتەکا سپی ل دەستێ وێ ئان پێ وێ.

١٣ ـ شەمام ـ ئەو بزنە یا خیچەکا ب سوریڤە ل ناڤ چاڤێن وێ.

١٤ ـ کەمەر ـ ئەو بزنە یا ناڤ طەنگا وێ خیچەکا سپی لێ بیت.

١٥ ـ چەم ـ ئەو بزنە یا گوهێن وێ ناڤنجی

١٦ ـ قوپ ـ ئەو بزنە یا شاخەکێ وێ شکە ستی.

١٧ ـ دوّ قور ـ ئەو بزنە یا نەش قنێتا خوە نێری دڤێت ژ قنێتە بیت نە وەکی بەرانی یە گوتنەکا مەزنا هەیە دبێژیت [نێری ژ ماك بەرانی پاك]

١٨ ـ مویر ـ ئەو بزنە یا مویێ تێتە دەر وەکی خەلەکێ یە.

١٩ ـ شینی ـ بزنا شینە.

٢٠ ـ چال ـ ئەو بزنە یا پنیەکا سپی ل ئەنیا وێ.

٢١ ـ خمورە ـ بزنا تێ کەلەیە.

٢٢ ـ پوخین ـ بزنا ناڤ چاڤێت وێ سورەکێ ڤە بووی.

٢٣ ـ ڤاڤێل ـ ئەو بزنە یا کتەکا گوهێ وێ خار.

٢٤ ـ زیل ـ ئەو بزنە یا خەتەکا زەر ژوردان کی ل رویێ وێ.

٢٥ ـ ئێف شنگ ـ ئەو بزنە یا کەهرکێ وێ دمریت.

هندەك بزن هەنە دوو رەنگن دکرن ئو دکالن دبێژن وان کرە کال ئان دکرن ئو سیسن دبیژنێ کرە سیس.

**ب ـ پەزێ سپی [میهـ ـ مـهـ]**

١ ـ سەر رەش ئەو مەهە یا سەرو ناڤ چاڤێن وێ رەش.

٢ ـ کەر ـ ئەو مەهە یا گوهێت وێ.

٣ ـ کەل ـ ئەو مەهە یا ب شاخ.

٤ ـ کوریس ـ ئەو مەهە یا گوهێت وێ لویلی.

٥ ـ رسەر ـ ئەو مەهە یا سەرێ وێ حەتا ناڤ چاڤێن وێ نەد رەش و سپی، سور بڤە.

٦ ـ کەوی سار ـ ئەو مەهە یا ناڤ چاڤێن وێ سپی.

٧ ـ ئەو مەهە یا رەش.

٨ ـ بوّز ـ تە بوّز ـ ئەو مەهە یا ناڤ چاڤێن وێ سپیڤە ـ بن.

٩ ـ بەش ـ ئەو مەهە یا ناڤ چاڤێن وێ سپی.

١٠ ـ تەزەر ـ ئەو مەهە یا ناڤ چاڤێن وێ زەر.

١١ ـ قەمەر ـ ئەو مەهە یا رەشەکێ ڤەبووی.

١٢ ـ باز ـ ئەو مەهە یا دەست و پێن وێ سپی.

١٣ ـ تەحلە ـ ئەو مەهە یا ناڤ چاڤێن وێ سوریڤە بن

### ج ـ ناڤێن پەزی ژ لایێ نێرو مێ ڤە

ا ـ پەزێ سپی [نێر].

١ ـ بەرخ ـ هندی شیری بخۆت.

٢ ـ کاڤر ـ هەکو شیر ڤەکر

٣ ـ شەك ـ هەکو ژیێ وی بوو دوو سال.

٤ ـ هوگژ ـ هەکو ژیێ وی بو سێ سال.

٥ ـ بەران ـ پشتی چار سالێ.

٦ ـ قەرتە ـ ئان قەیرە ـ بەرانێ بناڤ سال ڤە چووی.

### ب ـ پەزێ سپی [مێ]

١ ـ بەرخ ـ هندی شیری بخۆت.

٢ ـ کاڤر ـ گەل شیر ڤەکر

٣ ـ بەلندیر ـ ژیێ وێ دوو سالی یە.

٤ ـ بەلندیرزا ـ هەکو بەرێ ئێکێ زا پشتی دوو سالێ.

٥ ـ مهـ ـ میهـ ـ پشتی سێ سالێت چار سالێ.

### ج ـ پەزێ رەش [نێر]

١ ـ کەهر ـ کار ـ کارك ـ هندی شیری بخۆت.

٢ ـ گیسك ـ گەل شیر ڤەکر.

٣ ـ کویر ـ د ژیێ دوو سالێ دا.

٤ ـ سەیس ـ سالا سێیێ.

٥ ـ نێری ـ سالا چارێ.

### ء ـ پەزێ رەش [مێ]

١ ـ کەهر ـ هندی شیری بخۆت.

٢ ـ گیسك ـ گەل شیر ڤەکر.

٣ ـ تشتویر ـ دوو سالێ.

٤ ـ تشتویر زا ـ بەرێ ئێکێ هەکە زا پشتی دوو سالێ.

٥ ـ بزن ـ پشتی سێ سالێ.

### ء ـ ئێشێن پەزی

١ ـ سویسکی ـ کماخێن وان خو نا دەن بەر.
[چارە] دا ئێنن پار چەکا تەختی ل کماخێن وێ گرن ئو دا باش گریدەن.

٢ ـ شەبـەکی ـ لەنگـەر دبـوون، سومێك وان خلوولە بوون.
[چارە] شەبا شین و مازویا شین دگەل تیڤلێ هنارا شیرین دا قوتن و دا کنێ.

٣ ـ طە بەکی ـ تی طەب دبوون، ئانکو ویر لێ هاتن، دینەکە لێ دهاتن. [چارە] رهەك یا لبەر چاڤێ وان دبری چێ دبوون.

٤ ـ فەکاوری ـ لاما وان ئان ئالەکا وان دوەرمی ـ [چارە] لاما وان شەق دکر ئەو تشت دئینا دەر جارەکا دی دا دورین.

٥ ـ گوریاتی ـ مویێ وان ئان هریا وان دوەرها [چارە] دوهنێ ڤێری تێ درا.

٦ ـ لەنگـەر ـ شافك ناڤبەینا سومێن وان را دهاتن ئان کول دبوون. [چارە] قاچکێ هەلزێ ئان بەنیشت دکرە ناڤ سومێن وان.

٧ ـ خوین گرتن ـ رهێن ناف چاڤێن وان دیار دبوون لەشێ وان گەرم دبوو. [چارە]دا ئینن شویژ نەکێ ل رها گوهێ وێ ون دا خوینەکا رەش ژێ هێت دا چێ بیت.

٨ ـ تێ هنك ـ هێلاکا وان سوور دبیت [چارە] تێر ئاف دەن.

٩ ـ باوشی ـ شیرێ وان خراب دبیت. [چاره] رها رێڤا سێو هەگدانێ دا هێرن و تێ دەن.

١٠ ـ تاوی ـ گێژ دبن. [چاره] بێهنەکێ دا کن د ئاڤێ دا.

١١ ـ ژ کلك گرتن. ئەڤ ئێشه بزنا دگریت گەله کاره کارێ دکن [چاره] کوریا وان شەق دکر هندەك خوێ پێوەر دکر.

١٢ ـ حەمەر بوون ـ هەکه گەلەك جەهـ دخار حەمەر دبن. [چاره] شەربەتا شەکرێ ددایێ.

١٣ ـ زەرکی. ناڤ چاڤێت وان زەر د بوون. [چاره] شەبا شین دکر ناڤ شیری و تێددا.

١٤ ـ کرم شێلاڤ ـ ئەرزنکا وان شوّر دبوو کرمەك د شێلاڤا واندا بوو. [چاره] شەبا شین دکر ناڤ شیریو ددایێ ئەو کرم دمرو چێد بوونه ڤه.

١٥ ـ ژ گوهان گرتن ـ گوهانێ وان دوەرمین شیرێ وان خرابد بوو. [چاره] ریخا وێ بخو هەر تێددا.

**هـ ـ ئاخڤتنا مروّڤا دگەل پەزی**

**أ ـ پەزێ سپی**

**١ ـ بو گازی کرنێ دگوتێ: [هر، هر]**

**٢ ـ لو ئاژوّتنی دگوتی [......]**

**٣ ـ بو راوەستانێ دگوتێ: [هویز]**

**٤ ـ بو ژێك ڤەگرتنێ دگوتێ [چویز]**

**ب ـ پەزێ رەش**

**١ ـ بو گازی کرنێ دگوتێ [عێ، عێ]**

**٢ ـ بو ئاژوتنێ دگوتێ [چـته]**

**٣ ـ بو راوەستانێ دگوتێ [ئیشت]**

**٤ ـ بو ژێك ڤەگرتنێ دگوتێ [چێر، چێر]**

**٥ ـ هەکه پەزێ سپیو یێ رەش ژێك ڤەکرتبا دکوتێ [هاڤی، هاڤی]**

●

**فەرهەنگ**

١ ـ بر ـ کەر ـ پەزێ چەند مالەکا دکره ناڤێك دگوتێ بر ئان کەر

٢ ـ مشتی ـ ئەو ئالفه یێ بو پەزی کری بو زڤستانێ

٣ ـ کەرکول ـ وەکی هەلزێ یه، بەلێ وەکی وێ بلند نابیت

٤ ـ بێچك ـ کەهرو بەرخێت ئێك سالێ.

٥ ـ بێ چو بێر ـ شیر بر ـ ئانکو ئێدی بێچکا نا مێژینن.

٦ ـ شەڤین ـ پشتی دەم ژمێر سێی شەڤێ پەز را دکر چەرێ نێزیکی دوو دەم ژمێرا دگوت وێ شەڤێن

٧ ـ پالین ـ ناڤبەینا دانێ سپێدێو دانێ ئێڤاری پەز رادکر چەرێ دگوت وێ پالین.

٨ ـ مەخەل ـ پشت روژ ـ ئەو جەه یێ پەز تەحرێ ڤە دچێتێ بن سێبەرێ.

٩ ـ هەڤشی ـ جهێ پەز شەڤێ بێهنا خو ڤەدکت.

**ژێدەرو تێ دیتن.**

١ ـ روشنبـیری نوێ ژمـاره [٨٥] سالا ١٩٨١ عبـدالرحمن نقشبندی پەزو رەوشت.

٢ ـ روشنبـیری نوێ ژمـاره [١١١] سالا ١٩٨٦ عبدالکریم دوسکی زاراڤێد فولکلوری.

٣ ـ ژ زار دەڤێ [طه عبدالعزیز] ژ دایك بونا وی سالا ١٩٤٦ خەلکی گوندێ هرورە.

٤ ـ ژ زار دەڤێ [مصطفی عبدالعزیز] ژ دایك بونا وی سالا ١٩٢٣ ژ زاروکیا خو تێکەلی دگەل پەزی کریه نهو یێ ئاکنجیه ل گوندێ مالطایێ.

٥ ـ ژ زار دەڤێ [حەجی عبدالله لوند] کوچەره ژ دایك بونا وی سالا ١٩٢٢ ژ بچویکیا خو حەتا ڤان سالا شڤانی یا کری.




# شای بازان

مولود قادر بێخالی

**شای بازان**

باز شای هەمـوو جۆرە باڵنـدەیـەکەو دروشم هێمای هەموو پادشـایـەکـە، باز لە زۆر ئەفسـانـەی کۆنی رۆمـانیـەکاندا ئەنگوستی بۆ درێژ دەکرێت کە توانای بەر بەرەکانی هەورە تریشقـەو بروسکی هەیـە، بۆیـە هەرگیـز باڵەکـانیان دەنێو کشتیـاردا دەنـاشت بۆ پاراستنی بەرو بووم لە جۆرەهـای کارەساتی سروشتی، هەروەها لە سەرەتای مێژووی ـ ڤیدا[١] دا هاتووە کەباز بەدەنی پیرۆزی ئادەمیزادی بۆ سەرزەوی هاوور دووە، لە ئاوێستـاش دا هاتووە کەباز لە نێوداری ئەفسانەی چارەسەریدا ژیاوە[٢] .

باز لە هەموو وڵاتانی سەر زەمین دا بە باڵندەیەکی گورج و گوڵ تیژو تەووژم ناسراوە، چونکە لە توانایدا هەیە بگاتە بەرزترین پلە لە ئاسمان و کەشکەلانی فەلەك.

هەر لەبەر ئەم توانایەشیەوە هێلانەکەی بەسانا بۆ ئادەمیزدا نادۆزرێتەوە، چاوێکی تیژو تەمەنێکی درێژی هەیە بۆیە گەلێ بنـەمـاڵەو هۆز خۆیان لەباز کوشتن دەپارێزن... گۆیا بۆیان دەبێتە ئاژاوەو ئاڵۆزیو سەر گەردان..!

باز بۆ گەلی کردەوەی باشـە باشەو سوود بەخشە، لە زەمانی حەزرەتی ـ نووح ـ د ـ لە نێـو پەستگـاکـانی ئەو سەردەم پەرستگایەك بووە[٣] .

باز لە زۆر کتێبی ئاینی کۆندا بەر لە سەر هەڵدانی ئاینی ئیسلام و لە سەر دەمـی هەڵدانـی ئاینـی ئیسـلام و لە سەر دەمی ئیسلامیش دا بە باڵندەکایەنی پیرۆزو بە کەلك ناوی دێت و بە نموونەی باشی لەقەڵەم دەدرێت، شێخی سەعدی لە گوڵستاندا فەرمـویەتی ـ مەچووە ژێر سێبەری کوندەبۆ ئەگەر سێبەری ـهوما ـ[*] لە جیهان دا نەبوو،

### ★ بازو جۆرەکانی[٤] ★

باز زۆر جۆری هەیە، گرنگە بەناو بانگەکانی ئەمانەیە:ـ

١) تەوار کەتـرلانە ـ رەنگی تووکەکەی بەسپی دەروانی ئەم جۆرەیـان زۆر بەتـین و توانایە پێش جۆرەکانی دیش مەشق دەگرێت، ئەوەی راوچی مەبەستی بێت لەمەشق فێری دەبێت..!

٢) جورە ـ قزل ـ رەنگی تووکەکەی بەلای سووریو زەردیدا دەروانێت لە جۆرەکـانیتر ئازاترە، بەکەلەشیش لە ـ ترلان ـ بچووك ترە، بۆیە هێندە پەسند نییە.

٣) فەرخی مێ ـ ئەم جۆرەیـان پەسندە چونکە راوچی چۆنی مەبەست بێ ئاوهای بۆ مەشق دەدرێ..!

٤) باشوکە ـ لە رەسەنی بازە بەلام لە باز بچووك ترەو خڕین و جوانترە لە هەموو باڵندەیەکیش بۆ فڕین سووکترە، هەرگیز خۆنەکرەو نابەنگە کاتی سەرو دڵی خۆشە کاتی بێ مەی سەرخۆشە توورەو توندو بێن درێژە، دوو رانی تووکنی چنگ بە نینۆك درێژی هەیە، حەز لە راوی ووردە باڵندە دەکات، جا ئەگەر بێو باڵندەیەك مل ملانێی دەگەڵ بکات هەتا یەکێکیان لە نێو نەچێت کۆڵ نادات...!!!



٥) کوندەبو ـ ئەمەشیان بەرەسەن دەچێتەوە سەر پۆلی باز بەلام هەڵسو کەوتی باز ناکات، تەبەشێکی پان و دوو چاوی گەورەو سینگێکی سپی تووکنی هەیە، هەرگیز منەی سەر لوتکە شاخ و بەرزی لکی دار دەکات، تەنانەت راوی بەچکە کەروێشك و مشکو مار دەکات، بەسەبرەو بەزەبرە، لای میسری یە کۆنەکان هیمای مردن و شەوی ساردو سەرما دەکات، بۆیە خۆی لێ لادەدەن و بەوێنەری شوومی لە قەڵەم دەدەن، کەچی فرێنشی پەسند دەکەن.

زەردەشتنیەکانیش تووکی کوندە بۆیان دەپۆشت هەتا دوور بن لە جۆرەهای نەخۆشی و کوشت (٥)

٦) هەلو ـ هەر لە رەسەنی بازەو لەبنەماڵەی باڵندە درندە گۆشت خۆرەکانە، راوی ئاسك و کەروێشك و قازو قولینگ و شینەشاوە دەکات، بەفەرخەیی گرتنی سانا نی یە چونکە لەشوێنی زۆر سەخت نەبێت هێلانەی نی یە، بۆیە وەبەر دەست کەوتنی بۆ ئادەمیزاد سانا نی یە.

٧) دوو برا ـ لەهەلو دەکات لەبنە ماڵەی درندە گۆشت جۆرەکانی، بەلام بەجووتە نەبێت بە دەگمەن دەفرێت، لە شوێنی هەلدێرو سەخت نەبێت هێلانە ناکات، گەلێکیش مەیلی گەرمیان ناکات، کە راو دەکات یەکێکیان خۆ دەنێچیر دەکات ئەوی تریان بە دەوریدا سوردەدات ـ خول دەدات ـ جا ئەگەر براکەی نەگیرا ئەوی تریان خۆی تێ دەکات گەلێ گورج و چاپووکن نێچیر بەدەگمەن لەبەر زەبرو زەنگیان رزگار دەبێت..!

ئەم جۆرەیان ماڵی نابێت مەشق نادرێت، جار وا دەبێت بە بەچکەیی وەبەر دەستیان دەکەوێت نەختێك دەستەمۆ دەبێت، بەلام هەر هەڵێکی بچووکی بۆ هەڵکەوێت هەتاتێنی تێدایە دەفرێت



• دالاش ـ خەرتەل ـ ئەمەشیان وەك سیسارك لە رەسەنی‌بازە
ـەلام بەکەلەش لە هەموو جۆرەکانی تر گەورەترەو بالەکانیشی
ـن و بەرین ترە، سەلکێکی گەورەو دوو قاچی درێژی تووکنی
جنگ بە نینۆکی وەك خەنجەری هەیە چرنۆك لە هەر نێچیرو
ـژەڵی گیر کات بێ سێو دوو بەرەو ئاسمانی دەبات...!
ـە باڵندە درندە گۆشت خۆرەکانە لە بەرزی شاخاندا دەژی لە
کەنـدو لەنـدانیش دا بۆ راو شوێنی دەبی، چاوی زۆر تیژەو
ـووش بۆن دەکات، بۆیە بەکۆمەڵ روو دەشوێنی بە کەلاك
ـەکات.

ـەگشتی باز باڵندەیەکی لەسەر خۆیەو زوو مەشق دەدرێت ـ
ـەرگیـز داماوە هەوەسی زۆر بەشوێنی ـ تاری ـ تاریك دێت،
ـسکـەوزوو نەخـۆشی دەگرێت، لەکاتی فرینیش دا زوو تێنو
ـەبێت، پاش ماوەیەکی کەم سستی دەبالان دەکەوێت....!!!
ـر بە هەموو پۆلەکانی لە زۆر بەی زۆری هەقایەت و ئەفسانەی
کوردەواریـدا ناویء دێت و گەلێ سەر بردەی سەیر سەیری
ـەڵ دەندرێت، بۆ نموونە:ـ
ـەگـێرنـەوە:ـ پاشایێ دەبێت گەلێ بەسام و زەبر بەدەست و
ـاماندار دەبێت، توانایەکی ئەو تۆی دەبێت یاخی بووو لە بن
ـەی هەوریش بێت دەستگیری بکات.

ـۆژێك لەناكاو ـ گول[*] ـ دەبێت گەلێکی بۆ هەوڵ دەدەن کەسێ
ـدۆزنەوە چارە سەری ئەم نەخۆشی‌یەی بۆ بکرێت، لەهەر چوار
گۆشـەی جیهـاندا هەر نوژدارێك هەبێت بۆلای دەچن بەڵکو
ـەرمـانێکی وایـان نیشان بدات ئەم نەخۆشی‌یەی پاشا چارە
بکات، لە ئەزیەت و ئازار رزگاری بکات، بەم هەوڵ و تەقەلایە

ناگاتە ئەنجامێ کە دەرمانی هەبێت پاشای پێ لە ئازاری ئەم
نەخۆشی‌یە دەرباز بکات...!

گەلیـك بێ زەوەر دەبێت و کرمی دەمبرینان دەکەوێت، لەخۆی
بێزار دەبێت و ناڵە ناڵی دەگاتە کەشکەلانی فەلەك کافری پێ
بوسڵمان دەبێت لەبەر ئیشق و ئازار سەڵتەنەتی پاشایەتیشی
لەبەر چاوان دەکەوێت، هەموو کاتێ ئاواتی مردن دەبێت، دوو
یاوەری ئاقڵ و ژیری دەبێت روویان تێ دەکات و دەڵێت:ـ
ئەرێ ئێوە دابەستەنە...؟! کەی بەهانای منەوە دێن...؟

یاوەری دەستە راست وەلامی دەداتەوەو دەڵێت:ـ
گەورەم ئەم بێن تەنـگـی‌یـەی پێ ناوێـت ئەگـەر
بێو ماوەم بدەیـت کارێـکـی ئەو تۆ دەکـەم

خواشیفاتان پێ بدات ـ بینرێت ـ، پاشاش گوتی بخوازە ئەوەی
پێت دەوێت، بۆ دۆزینەوەی دەرمانی دەردم تەختی پادشایشم
وەبەر چاوان نایەت، یاوەر وەلامی دایەوەو گوتی: گەورەم نەماڵم
دەوێ نەگەنجی دونیا لە یەزدانی پاك ئاواتە خوازم دەوات پێ
بدا،
ئەم یاوەرەیان دەیزانی نوژدارێکی پسپۆرلە دووری شاری لە
ئەشکـەوتێـك عیبادەتی خوا دەکات و گەلێ نەخۆشی گرانیشی
چارەسـەر کردووە، جا بە هەر جۆرێ بوو بۆلای ئەم نۆژدارە
پسپۆرە چووە، بەڵکو رێگای دۆزینەوەی دەرمانێکی پێ بدات.
نۆژداری نێـو براو پاش ئەوەی چەنـد کتێبێك هەڵگێرو وەرگێر
دەکـات، شوکرو سەنای خوا دەکات و دەڵێت دەرمانی ئێودم
دۆزی‌یەوە، جا ئێوەش چۆنی وە دەست دێنن ئەمەیان پەیوەندی
بەمنەوە نی‌یە.
یاوەر کە ئەم وەلامەی وەبەر گوێ کەوت لەخۆشیانا گریاز کەوت
و گوتی بەخوا ئەگەر بێت و ئەم دەرمانە لە پشت قوللەی قافیشق
بێت یان شیری شێرش بێت لە مەشکەی شێر دابێت لەپشتی
شێر بارکرابێت شێریش قەتار چێی بێت دەبێ هەر بەدەستمان
بکات، تا زوو وەبڵێ چی‌یە...؟
پاداشت ئەم هەگبـە زێرەم بۆ وەلامت هاوور دهایە، نۆژداری
پسپـۆر گوتی: چێت لێ بشـارمـەوە... خوێنی شای بازان...
دەرمانە بۆ ئەم جۆرە دەردانە....!!!
یاوەر گوتـی: جا ئەم خوێـنـە چۆن وە دەست دەگـات...؟!
نۆژداری پسپـۆر وەلامی دایـەوەو گوتی:ـ من پەیوەندیم بەم
پرسیـارە نی‌یـە هەر ئەوەنـدەم لەسەرد، ئەم دەرمانەی چارە
سەرە، بەڵێنیش دەدەم ئەگەر بەم خوینەچارەی نەکرا پاشا بۆی
هەیە لەسەرم بدا....!!!
یاوەر گەرایـەوە لەگـەڵ یاوەری دەستـە چەپ کۆبونەوە هەتا
رێگایەك بۆ گرتنی شای بازان بدۆزیتەوە، چونکە یاوەری دەستە
چەپ ئاگاداری راوو شکار بوو دەی زانی لەچ وەرزو کاتێکدا

تەیرو تاڵ کوێستان و گەرمێن دەکەن، بۆیە گوتی برا ئەوەی من ئاگاداریم و دەیزانم شای بازان ساڵی دوو سەر لە هەرێمی ئێمە دەدا لە سەرەتای بەهار کە دەشت و کێو سەووز دەبن و چرۆزەرەی گوڵ و گوڵزار سەر هەڵدەدات بەرەو کوێستانانەوە دەچێت. لەئاخە لێودی پایزیش دا کە مێوەجات پێ پێ دەگات و تری بە مێووژ دەبێت بەرەو هەواری زستانییەوە دێت، جا دەبێ لەم دوو وەرزەدا شتێکی ئەو تۆو بکەین بەڵکو وەبەر دەستانی دەخەین. بەهەردووکیان لەسەرەتای بەهاردا چەند ووشترو گارەش و کاووری قەڵەو قەڵەویان لە ئەرزدا ـ بەمانای سەر برین ـ و گۆشتەکانیان لەسەر بەرز ترین لوتکەی شاخان بۆ رەوەی بازان کرد بەچێشت و قاوەڵتی...! بەڵکو دەنیشن و خەریکی خواردن دەبن و بەسانا بەتەڵەیەوە دەبن، جا کەرەوەی بازان گەیشتنە ئەم خواردنەوەش هەر شێت بوو بوون، شای بازان فەرمانیدا رەوەی بازان پشووبدا، ئەوەندی نەمابوو شای بازان قاچ بەسەر زەویدا...!

راوێژ کەرێکی دڵسۆزو ئاقڵ مەندی هەبوو شاپەرێکی لە پشتیداو گوتی: نەکەی، داوە...!!!

ناچار بە زگی برسی‌و لەشی ماندو لەم میل و باسکە ئاوا بوو، ئەو ـــا دووبارە فەرمان درا رەوەی بازان پشووبدا، لەبەر ئەوەی هێندێکیان لەرو لاوازبوون توانای ئەم بەردەوام بونەیان نەبوو هەر لەرێگا تەواو بوون، جاکە گەیشتە مەڵبەندی مەبەست دەست بەجێ رەوەی بازان کۆمەلیان بەست سزا دانی سەبەب کاری ئەم کارەساتە، لە ئەنجامدا راوێژ کاری شای بازان فەرمانی لە دار دانی درا...! لەگەڵ ئەوەیش دا هەموو پیلان و ماندوبونی یاوەرانی پادشا پرو پوچ کرا، پاشاکە هەواڵی نەگرتنی شای بازانی پێ دەگا گەلێك سەخڵەت دەبێ‌و بەرگی غەزەب لە بەردەکاو،داوای سزا دانی یاوەرەکانی دەکا، پاش پارانەوەو دڵدانەوە بۆ جاری دووەم ماودیان دەدا. ئەگەر بێ‌و ئەو جارەیان سەر نەکەون لە سەریان دەدا، جاکە پایز داهات جارێکی‌تر داوەت بۆ گەرانەوەی رەوەی بازان ساز دراو لەهەمان شوێن ئامادە کرا، جاکە کۆمەڵی بازان هات و چاوی بەم داوەتە نازدارە کەوت، راوێژکاری تازەی شای بازان هات و گرتی میران ئەوجارەیان ئەم گۆشتە خۆشەو داودتە باشە با وەك جاری پێشوو لە دەست خۆ نەدەین و چەندێکی تریش لە نێو نەبەین...،

ماوە هەیە فەرمانی پشوودان بدەین...؟ شای وەڵامی دایەوەو گوتی: بەڵێ بۆی دابەزن پیرو بچووك و مەزن، شای بازان هێشتا قاچی بەتەواوی نەگەیبوونە سەر زەوی تەقژنێك هات...!!! هەردوو قاچ و باڵەکانی وە یەك هات و بە تەڵەیەوە بوو، چەند خزم و دڵسۆزێکی هەبوو گەلێکیان بۆ هەوڵ دا بەر لەوەی ئادەمیزادی پێ بگا، چارەیەکیان بۆ نەکرا...!

پیاوانی پادشا تاویان دایە سەری بە چەقۆی تیژو خەنجەری هەتا سەری جیاواز کەنەوە لە دەنی...!، راوێژ کەرەکەی تازەی شای بازان کە ئەوەی، لە شەقەی باڵانی‌داو فری لەگەڵ دەستەو بەری، ئەوسا شای بازان وەقسە هات و گوتی:ـ

موستەحەقم بم کوژنەوە تازووە ، چونکە بەگوێ ئەوانەم نەکرد کە خۆیان بۆ بەختەوەری ژیان من بەخت دەکرد، بە قسەی نەمیم و تەماح کارو ترسنۆکانم کرد هەتا بەم جۆرە خۆم بەتەڵەوە کرد، سەریان بری‌و خوێنەکەیان هێنایەوەو دەبەدەنی پاشایان هەڵسوی. سەریان بری‌و خوێنەکەیان هێنایەوەو دەبەدەنی پاشایان هەڵسوی، ئەوەی نەخۆشی بێت لەبەدەنی پادشادا نەما. روتەکانی شای بازانیش بەئاوی زێر نەخش دران.

باز وانەبێ هەر دەرمان بووبێت...! لە کۆنەوە دروشم وهیمای خواوەندیش بووەو بۆ گەلێ کردەوەی باشیش سوودی بووە.

سەردرای ئەمانەی سەرەوە لەم لێکۆڵینەوەدا ئەوەمان وەدەست دەگا، باز بۆ گەلێ دروشم و هیما لە نێو دڵی میللەتاندا جێ خۆی کردۆتەوە باز دروشمێکی تایبەت بە خواوەندی .زووس. واندرا ـ ی هێندۆستی بووە، لەباکوری رۆژ ئاوای وولاتیشماندا لە شاری ـ حەزرەر هەترا ـ بە باڵ کراوەیی‌و وێك هاتووی دروشمی ئاڵای میری بووە، وێنەی باز وەك وێنەرێکی ئاسمان ئاڵای رژێم و

سینگ و بەرۆکی سوپا سالارو سەربازەکانی رۆمانی پێ
رازاندوتەوە، باز نیشانەی روح سوکیو دڵ فراوانی‌یە، چونکە
بەزمانی ـ هیروگلۆفی ـ پیتی ـأـ نیشانەکەی بازەو مانای
ژیانێکی هێمن و ئاسودەو ساکار دەدات.
باز لە سوریای کۆندا لە هونەری رۆمانتیکیدا بە هەر دوو
دەست هانا وەبەر خۆردا دەبا بەمانای روح بەرەو نەمری دەبا،
دیانەکانیش باز بە وێنەی ئاسمان دادەنێن، گوایە هەر بەرز
بونەوەیەکی بەرەو ئاسمان پارانەوەیە لە یەزدان، گەرانەوەشی بۆ
سەر زەوی خۆشیو دڵدانەوەیە، بۆیە ـ قەشە، جیرودم ـ دەڵێت:
چونکە باز جیاوازیێکی گەورەی هەیە لەگەڵ باڵندەکانی تربۆ
فرین و بەرز بونەوە، هەڵسانی بەرەو ئاسمان نیشانەی
خواوەندیو پارانەوەیە لە خوای گەورەو میهرەبان، هەر بۆیەش
هیمای هێزو وزەی جەنگاوەرەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانەکانی
بووە، باز کە نێچیر بەرەو ئاسمان دەبات خەڵاتی سەرکەوتنە
بەهێزی ئاسمانی دەدات ـ دانتی ـ دەڵێت باز باڵندیەکی
تایبەت بەخوایە.

لە شاری ـ لەگش ـ کە لە باشووری وولات بووە لەسەر دەمی
سۆمەریەکان باز ـ دووشمایان بووە، بۆیە بە دوری نازانم ـ
روخ ـ ی عزەبیش هەر جۆرە بازێك بووبێت، لای میسریە
کۆنەکانیش هەر باز هیمای خوای ـ حورس ـ رۆژ هەڵاتە، خۆ
هێندیە سوورەکانی ئەمریکاش لەم بروایەدان کە ئەو خوڵەی
باز پێرلەی تێدا دەکات گەلێ نەخۆشی چارە سەر دەکات...!

**باز لە خەون دا:ـ**

لە لێکدانەوەی گەلێ خەون دا ئەوەمان وەدەست دەگا ـ ئەوەی
باز لە خەودا ببینێت یان بە سوڵتان دەبێت یان خوای گەورەو
میهرەبان کورێکی خوو رەوشت باشی پێ دەدات، بەڵام ئەگەر
یەکێك لەخەودا دی باز راوی دەنێ ـ سەری دەدوودەنێ ـ
مانای ئەوەیە دەسەڵات داری ناوچەی لێ بەرق دادەچی، بەڵام
ئەگەر پاشماوەی بازی دیت مانای ئەوەیە رو بەروی زۆری
داری دەبێت، بەڵام ئەگەر پەراموچکەی بازی دیت لە سەربانی
خانوی خۆیدا یان لەنێو زەویو زاریدا مانای ئەوەیە ـ ملك
الموت ـ دەبینێت، بەڵام ئەگەر هاتو وای بۆ دەرکەوت پەرمکەی
وەسەرسەری کەوت ـ مانای ئەوەیە ـ لەم جیهانە وە دوور
دەکەوێت، خۆ ئەگەر باز بریندار ی دەکرد ـ مانای ئەوەیە ـ حاڵ
و گوزەرانی ئاڵۆز دەبێت، وەئەگەر لە خەودا دیتت بازت لێ یاخی
دەبێت ـ مانای ئەوەیە ـ سەرۆکی ناوچەت لێ زوێر دەبێت بەڵام
ئەگەر لەخەودا دیتت پەراموچە یان ئیسقلێکی بازت وەدەست
دەکەوێت مانای ئەوەیە ـ پایە دەبێت و، بەخاوەنی
سەروسامانێکی چاکیش دەبێت.
باز لە فریندا لەهەموو باڵندەیەك سووکترو بەتەوژم ترە، چاوی
زۆر تیژو تەمەنیشی درێژە، بۆیە ئەوەی لە خەودابیبینێت بووە
بەباز تەمەنی درێژ دەبێت.

**بازو ئادەمیزادو هەڵبژاردن:ـ**

لە گەلێ هەقایەتی کوردەواریدا گوێمان لێ بووە ـ پادشایەکی
ئۆجاغ کوێری ناوچە کەمردووەو کەسی نەبووە بەجێگری ببێت،
دانیشتوانی ناوچە ناچار بوون باز هەڵدەن، تا کاروباری ناوچە
بەو کەسە بدەن کە سێ جار باز لەسەری دەنیشێت، جا لە نێوان
ئەم هەڵبژاردنەدا هەرکەسێ باز سێ جاران وەسەری بدات بێ
سێو دووکارو باری راپەراندنی ناوچەکەیان بەو دەدا، سەری
رای ئەمەش باز لەگەڵ سەخڵەتیدا یارمەتی خاوەنەکەی دەداو
بە هانایەوە دێت و رزگاری دەکات،
ئەم باڵندە ژیرو نازدارە هەمیشە لەژێر زەبروزەنگی ئادەمیزاد
بە ئازارە، بەر لە ئێستا گەلێ میرو پادشا راوو شکاریان بەباز بە
جۆرە وەرزشێکی دادەنا، هەر بۆیەش کەسانێکی زۆربازیان
بەخێو دەکردو مەشق دەدا، هەتا چۆنیان ئارەزوو بێت ئەو تۆ
راویان بۆ بکات.

**بازو چەك:ـ**

کە چەك هاتە روو باز ئەو باوو بایەخی سەرەوەی چوو...!
ئادەمیزاد ئامێری ـ چەکی ـ لە باتی باز بەکار هێناو دژی
ئەویش بە کاری دێنێت، بۆیە ئەوەندە نەماوە بازو چەندەها
جۆرەی باڵندی بەسوودیش دەنێو بچێت، سەرە رای ـ چەك ـ
ئەو دەرمانانەی ئادەمیزاد بۆ پاراستنی کشتوکاڵ بەکاری
دێنێت بازیش لەبن و بوتردك دەر دێنێت، چونکە گەلێك باڵندە
دڕندەکانی تر بترسێنێت، باز دوو هەزار ساڵ بەر لە مێژووی
زاینی لە چین ـ بۆ جۆرەکانی راو مەشق دراوە بەرە بەرە گەیوەتە
رۆژ هەڵاتی رۆژ ئاواو ناوچەی عەربستان و ئەوروپا، گرنگتری...

بەڵگەی مێژوو بۆ ئەم بۆچونە ـ تابلۆیەك ـ ە لە پاشماوەی شاری ـ ـ خور زبـاد ـ ئاشوری دۆزراوەتەوە، وێنەی ڕاوچی‌یەك و بازی تێـدایە بۆ ڕاو دەچن، هەرە بەناوبانگەکانی ئەوروپا کە بایەخیان بە باز دەدا ـ ماریا ـیە شا ژنی ئیسکوتلندا، لەدڵ شاهیزی سێیەمی ئینگلیزیو ناپلیونی فەرەنسی‌یە.

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوەش بزانین هەر هەرێم و ناوچەیەك لەسەر روی زەمـین دا جۆری تایبەت بە ڕاوی خۆی هەبووە، بەڵام هەموو ڕاوچیانی بەباز لەم ڕایەدان کە دەبێ باز بەبەدەن ـ لاش ـ ە قورس نەبێت، جا بۆ گەیشتنـە ئەم قورسایی‌یە ڕاوچی‌یە ئینگلیزەکان بازیان دەکێشا، بەڵام ڕاوچی‌یە عەرەبەکان بەهۆی ڕاوەستـانی‌بـاز لەسـەر مەچـەکیـان پسپـۆر بوو بوون لە قورسـایـیـان، بازی مەیـلەو ڕەشی تووك کورتی چاو سوور دووربینە، چاو زەردو چاشینیش جێی بڕوایی نینە، توولکیش باوی نی‌یە چونکە لە شاخافێری فرۆ فیڵ بووە، بازی باڵ کورتی بەدەن ـ لاش ـە تورت و سەر بچووکی چاو زەردی کلك درێژی لەپ خری جنـگ درێژ لە هەمووان پەسەندترو ئازاترە، بازی سینگ پانی مل درێژی چوارشانەی ڕان بە تووکی قاچ کورتی پتەو کە هەر دەم دەگەڵ کلکی خەریکەو حەز لە ڕاوی کەوو پۆرو کۆتر دەکات، پێش برکێ لە هەموو جۆرەکانی تر دەکات.

بازی لە ڕوو لاوازی گەدە .بەتاڵ ئەو هێزەی نی‌یە بفرێت بەباڵ، بازی گەدەپـری ئاخنـاویش گێـل و وێل و گران دەبێت باش هەڵسو کەوتی ڕاوی بۆ ناکرێت، باشترینیان مام ناوەنجی‌یە، دۆزینەوەی ئەم پۆلەشیان لە پسپۆری ڕاوچی‌یە، لەگەڵ ئەوەش دا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاواو ناوچەکانی تریش دا چ جیاوازیێك دەربارەی ڕاووشکار بە باز لەنێو دارو درەخت و چۆل و بیابان دا هەبێت سەرەنجام هەر بەیەك ئامانج دەگات.

سەرچاوە و پەراوێز:ـ

١ ـ ڤیـدا لە ص ٢٠٣ی المـعـجم الفـولكلوري تأليف الدكتـور عبدالحميد يونس الدولى ١٩٨٣

٢ ـ هەمان سەرچاوەی سەرەوە

٣ ـ قورئانی پیرۆز ئایەتی ـ ٢١ ـ سورەتی ـ نووح ـ د ـ

٤ ـ لاپـەرە ـ ١٥٥، ١٥٦، ١٥٧، ١٥٨، ١٥٩ لە پەرتـووکـی ـ کوردەواری ـ دانـانی خوا لێ خۆش بوو مامۆستا نەمر علاءالدين السجادي چاپی ١٩٧٤

٥ ـ ص ٦٠ من مجلة التـراث الشعبي العدد الفصل الثاني ربيع ١٩٨٩ ـ موضوع رمز من عالم الحيوان ـ للدكتور سامي سعيد احمد.

٦ ـ لاپـەرە ـ ١٧٠ ـی پەرتـووکـی ـ کوردەواری ١٩٧٤ دانـانی مامۆستای نەمر علاءالدين السجادى

٧ ـ چەند هەقایەت خوانێکی پیری ناوچەی دەشتی هەولێرو ڕانیەو ڕدواندوز بۆیان گێراومەتەوە.

٨ ـ الصفحات ٧٨، ٧٩، ٨٠، من مجلة التراث الشعبي العدد الفصل الثانى ١٩٨٩ موضوع رمز من عالم الحيوان ـ للدكتور سامى سعيد الاحمد.

٩ ـ الصفحات ٦٠، ٦١، ٦٢، ٦٣ من مجلة التراث الشعبي العدد ١٠ / ل ٩٧٦ موضوع ـ صيد الصقور وتدريبها في المنطقة الشرقية ـ للأستاذ الفاضل كاظم سعدالدين.

١٠ ـ موسوعة غرائب العالم تاليف ابراهيم شرف الدين وعلى إبراهيم شرف الدين

★ گول ـ جۆرە نەخۆشی‌یەکی پیستەیە

★ تورت ـ توند، پتەو، ڕەق

★ هوما ـ جۆرە باڵندەیەکە لەشێوەی باز دەکات هەرچەندە نەختێ بچووك و خرپی‌ترە، بەڵام لەزۆربەی زۆری تەیرو توار لای شێخی سەعدی پیرۆزترە!

★ باز لە سەعاتێکدا دەتوانێت ٢٩٠ کیلومەتر ببڕێت.

تەمەنی باز لە ٢٠ ساڵ ٢٥ ساڵ دەبێت

★ البـوم ـ کونـدبو ـ لە سەرەتای دێری سێیەمی لاپەرە ١٣٦ی پەرتـووکی موسـوعـة الطيـور المصـورة بەردسـەن دەچێتـەوە سەربنەماڵەی باڵندە گۆشت خۆرەکان

★ لە لاپەرە ١٣٦ تا لاپەرە ١٩٣ باسی باڵندە گۆشت خۆرەکان دەکات کە ژمارەیان (٧٥) جۆرە بە پێنج بەشیش دابەشیان دەکات (٥١) جۆری ودبەر باز دەگـەنێت ئەم (٥١) جۆرەش بە چوار پۆل دادەنێت.

ئەم لێکـۆڵینـەوەی ئێمـەش تەنانەت گرنگەکانی پۆلێك لەم چوار پۆلانە دەگرێتەوە.

ـ موسوعة الطيور المصورة ـ تاليف المهندس دريد نوايا ـ من مكتبة طارق جامباز ـ

★ کشتیار کێلکەی زەویو زارە ـ

# چەکخانە ژەهرینەکان

گۆڕینی بۆ کوردی: صدیق شیخ محمود بەرزنجی

**بۆ ئەوەی بتوانین ڕێ بە خۆمان بدەین تا پێش بینی بە لێکۆڵینەوەیەکی تەواوەوە دەربارەی باری چەکە کیمیاییەکان لە هەشتاکاندا بکەین، بێ گومان وا چاکە پێشەکی کورتە باسێکی مێژووی دۆزینەوەی ئەو چەکانە بکەین بە ئومێدی گەیشتن بە گۆڕانە ناوەکییە شاراوەکانیو دەرخستنی ئاراستە بنەڕەتییەکانی. وەشتێکی سروشتی یەکە ئەم جۆرە پێش بینییانە ئەگەر بۆ ماوەیەکی مام ناوەندی دوابکەوێت هیچ نرخێکی نامێنێت ئەگەر بەشێوەیەکی ژیرانەو بەگوێرەی ئەوەی کە لە ڕاستیدا هەیەو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت بەدەر ئەنجامێکی بیرکارانە نەخەملێنرێت. ئەو دۆزینەوانەی کە بەهیچ شێوەیەك چاوەڕوان نەدەکرا - ئەمەش لەوانەیە لەو دۆزینەوانە گرنگتر بێت کە چاوەڕوان دەکرا، چونکە لەم بارەیاندا شۆڕشێك دروست دەکات - لەناوەڕۆکەکەیدا لە توانای پێش بینی کردندا نییە، بە تایبەتی ئەگەر خەملاندنە دەر ئەنجامەکە بۆ ماوەی دوورو درێژ بێت، چونکە ئێمە زیاتر وەك خەو یا مەزەندە پێشانی دەدەین نەك بیر ئاسا زانستییەکەی.**

لەوانەیە «جەنگی کیمیایی» ئەوەندە کۆن بێت بگاتە هەمان کۆنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەسەر زەویدا، وە ئەو گۆڕانانەی کە بەسەریدا هاتووە تا ساڵی ١٩٧٣ سنوورەکەی و پێشکەوتنی پیشەسازکردنەکەو بەکار هێنانەکەیەتی، کە بە دەوری خۆی کاری کردۆتە سەر سروشت و شێوە فیزیاییەکەی ماددە بەکار هێنراوەکان.

لە ڕاستیشدا ئەوەی کە بەکێوییەکان (متوحشين) ناویان دەبەن دەبینین تیری ژەهراوییان بەکارهێناوەو تا ئێستاش هەر بە کاری دەهێنن، وە توخمە سروشتییە بەکارهێنراوەکانیش لەوکارەدا (کۆرار[1] و هەندێك ژەهری ڕووەکیی ترە کە لە بنەڕەتدا کار لە کۆئەندامی دەماری دەکەن. ئەو بەربەستانەی کەرێ لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە چەك و ژەهرانە دەگرن یەکجار زۆرن:

کۆکردنەوەو هەڵگرتنی ماددە ژەهرییەکان سنووری هەیە، وە توانای سمینی لەشیان نییە تەنها بەهۆی بریندار کردنەوە نەبێت. هاویشتنی هەر تاکە تیرێك لەیەك کەس زیاتریش ناکوژێت.

بەکارهێنانی ماددە سووتێنەرەکان تازەترن، چونکە بەگشتی دەربارەی دەرکەوتە کیمیاییەکان لێزانینێکی زۆرتری دەوێت.

لە ساڵی (٤٢٩ پ ز)یندا ئەسپارتییەکان تێکەڵەیەکی قەتران و گۆگردیان بۆ سووتانی شارێك لە شارەکان بەکاردەهێنا، بەڵام هیندییە ئەمریکییەکان تیری سووتێنەریان هەبوو، وە ئاشوورییەکانیش وەك لە نەخش و نیگارەکانیانا دەردەکەوێت بۆ مەبەستی سوپایی «ئاگری شل» یان بەکار هێناوە، گریکەکانیش لە نزیکەی ساڵی ٣٥٠دا نەوت یان نەوتی ڕەشیان (پەترۆل) بۆ ئەو تێکەڵەیە زیاد کرد. لەسەدەی حەوتەمدا زانا خالینیکۆس (ئاگری کریجی) (النار الكريجية)

دۆزی‌یـــەوە، کە پەرچفــەیـەکی سەرەتـایی‌یـە بۆ گر هاویـژ (مــەنجـەنیق) کە (شلەیەکی سووتێنەرە بەهۆی سیفۆنێکەوە دەهــاوێــژرێت)و، بەکــارهێنانەکەشی تا سەدەکانی ناوەراست بەردەوام بوو هەروەها دوکەڵی چریان بۆ شاردنەوەی جم و جۆڵی لق و پەلە عەسکەری‌یەکان بەکاردەهێنا:
بۆ نمـوونـە سویـدی‌یـەکان لە ساڵی ۱۷۰۰دا لە پەرینەوەی رووباری (ئەلدەفینا) ئەو دوو کەڵەیان بەکار هێنا.

جوانترین کاری ئەو کۆمەڵگایانەی کە پێیان دەوترێت شارستـانی‌یەت؛ ئەوە بوو کە لەشەردا هیچ جۆرە ژەهرێکیان بەکارنەهێناوە. تەنانەت وەك دەردەکەوێت تا ساڵی ۱۸٦۲یش بیریـان لەبـەکـارهینـانی نەکـردوتـەوە. وە لەکاتی شەرە ناو خۆیی‌یەکەی ئەمریکادا پێشنیارێك هەبوو بۆ دروست کردنی بۆمبا بەکلۆر، بەلام کاربەدەستانی ئەمریکا ئەوەیان رەفز کردو، بەتـەواویش هۆی ئەو رەفزو پشت گوێ خستنەی ئەو چەکە نەزانـرا، لەوانـەشـە گۆرانکـاری‌یـەکی زانیـاری هونـەری پیشـەسـازی عەسکـەری تازەو زیـاتـریش لە سروشتـە فیـزیـایی‌یـەکـەیـەوە کە پەیـوەنـدەی بە پێشکـەوتنی تەقەمەنی‌یەکانەوە هەبێت بەشێکی کەم بێت لەو رەفز کردنە، سەرەرای گرانی‌ی بەرهەم هێنان و بەکارهێنانی بری یەکجار زۆرو تەواوی ئەو ماددە ژەهرانە. خۆلەوانەشە هەندێك نەریتی ئەخلاقی لەو رەفزو پشت گوێ خستنەدا دەوری هەبووبێت، چونکە بیر کردنەوە لە ژەهر تا رادەیەك و هەمیشە هاوتای ناپاکی‌یە.

پێشکـەوتنی پیشـەسازی‌یە کیمیایی‌یەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەندێك لەو بەر پەرچ دانەوانەی لەکار خست کە پەیـوەنـدەی بە زانیـاری‌ی هونەری پیشەسازی‌یەوە هەبوو، وەکـۆنگرەی ئاشتی‌ی جیهانی کە ساڵی ۱۸۹۹ لە لاهای گیرا بریـارێکی قەدەغـەکـردنی دەربـارەی «بـەکارهێنانی هەموو هاوێژراوێکی گاز بلاوکەرەوەی خنکێنەرو کوژەری» دەرکرد، لەو هەستەیانەوە کە جەنگی کیمیایی مەترسی‌یەکی زۆری هەیە بە بەڵگـەی ئەو بروایەی کە دەڵێت: ئەم نموونە رێبازە لەشەردا زۆر «نا مرۆڤایەتی‌یە». ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یەکەمین دەوڵەت بوو لە دەوڵەتە گەورەکاندا کە ئەو بریارەی مۆر نەکـرد: چونکـە بەراو تێروانینی ئەوان هێشتـا سیفـەتـە نا مرۆڤـایەتی‌یەکەی ئەو چەکە بەشێوەیەکی روون و تەواو دەر نەکەوتووە. زۆر بە چاکی ئەو بیرو رایە دەردەکەوێت کە هێشتا هەر یەکێکـە لەبـرواکـانی کار بەدەستـانی ئەمـریکـا، تەنها لەسەرەتای بیستەکاندا نەبێت: لەساڵی ۱۹۲٦دا ئەنجومەنی نوێنـەرانی ئەمـریکـا دووبـارە بەرپـەرچی مۆر کردنی تازە کردنەوەی قەدەغە کردنی چەکە کیمیایی‌یەکانی دایەوە لەلایەن کونگرەی جنێڤەوە، لەوێدا هەڵگری ئالای بەر پەرچ دانەوەکە فەیلەقێکی ئەمـریکی و کومپانیا کیمیایی‌یەکانی ئەمریکا بوو. وەلەگەڵ ئەوەشدا کە رۆزفلت (۱۹٤۳)و ئایزنهاوەر (۱۹٦۰)و گەلێکی کەیش لە کاربەدەستان و لێپرسراوانی ئەمریکا روون کردنـەوەو دوانیـان بلاو کردەوە، کەچی هێشتـا «گـازی دژە ئاژاوەیان» لە ڤیتنامدا بەکار هێنا، هەروەها گازی «گەلا رێژانی رووەك»یشیان بەکارهێنا، لەمەدا وەزارەتی بەرگری‌ی ئەمریکا گەیشتە ئەم بریارە: «لەسایەی ئەنجامی لێکۆڵینەوە تازەکانەوە دەتوانرێ هەندێك جۆری ئەو چەکە بۆ مەبەستی بەرگری بەکار بهێنرێت، لەهەمان کاتیشدا شوێنکارە لاوەکی‌یەکانی بەپێی توانا کەمترین سنوور بگرێتەوە».

لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بۆ یەکەم جار بەشێوەیەکی فراوان گاز بەکـار هێنـرا. هەرچـەنـدە گومـان لەوەدا نی‌یـە کە فەرەنسی‌یەکان لەهێرشێکیاندا ساڵی ۱۹۱٤ یەکەم کەس بوون لەبـەکـارهێنـانی گازی فرمێسـك رێژدا لەجۆری گازی «دژە ئاژاوەکـان»، (المضادة للشغب)، بەلام مێژووی راستەقینەی سەرەتای دەست پێکردنی جەنگی گازی (۲۲)ی نیسانی ساڵی ۱۹۱۵یە، ئەوکاتەی کە ئەڵمانەکان یەکەم هێرشیان بەگازی کلۆر کردە سەر فەرەنسی‌یـەکـان، چونکە لەو ماوەو کاتەدا هەردوو لایـەنـەکەی شەر زۆر [illegible] ـنگەرەکانیاندا کۆبـوو بوونـەوەو خۆیـان قایم کردبـوو، کەمترین هەنگاو بۆ پێشەوە دەبوو هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆری ئەوتۆی ئەو سەربـازانـە کە لە سنووری بروادا نەدەسەلمێنرا. گازەکەش بەکردنەوەی سەرقاپە تایبەتی‌یەکەی یەکێ لەبەرمیلە گازەکان دەگـیرایە شوێنی مەبەست، لەوەشدا متمانەیان دەکردە سەر ئاراستەی با بۆ گواستنەوەی گازەکە بەرەو رووی دوژمن. وەهەر

گۆڕانێکی چاوەڕوان نەکراویش بەسەر ئاراستەی با کەدا بهاتایە گازەکەی بەرەو هێرش بەران (بەکار هێنەری گازەکە ) دەگێڕایەوە، (وەك لە هێرشێکیاندا ڕوویدا).

بەو شێوەیە پێشکەوتنێکی کوتوپڕی زۆر گەورە لەو بوارەدا بەدی دەکەین ئەگەر لەگەڵ تیرە ژەهراوییەکاندا بەراوردی بکەین: چونکە لەمەیاندا ماددە ژەهرینەکان لەڕێگەی برینەوە ناچنە خوێنەوە، بەڵکو لە ڕێگەی هەناسەوە لەش هەڵی دەمژێت هێرش دەباتە سەرچاوو کۆئەندامی هەناسە. لە جیاتی ئەوەی وەك گوللە کار لەیەك کەس بکات و بیکوژێت، کار دەکاتە سەر کۆمەڵێك و بەتەواوی هەموویان لەناو دەبات.

بەڵام لەلایەکی تریشەوە لە چۆنیەتی بەکارهێنانەکەیدا کەم و کوڕی هەیە: وەك ئەگەر لە ماوەیەکی نزیکەوە نەبێت توانای بڵاو کردنەوەی نابێت، سەرەڕای ئەو مەترسییەی کە لە شوێنکاری گەرانەوەکەیدا هەیە». لەبەر ئەوە ڕواو ڕوو وەستانی هەردوو لایەنەکە تارادەیەك ئاسان بوو، کڵاو گازەکانیش بۆ خۆ پاراستن لە گازە هەرە سەرەتاییەکان مرۆڤی بەتەواوی دەپاراست، لەم بەکارهێنانەیاندا شوێنکاری گازەکان زۆر کوتوپڕ بوو، بەڵام نەك هەمیشەیی، چونکە هەوا زۆر بەخێرایی بڵاوەی پێ دەکرد، وەهەردوو سەربازگەکەی فەرەنساو ئەڵمانیا لەو ماوە شەڕەی نێوان (١٤ تا ١٨) هەموو هەوڵێکیان بۆ چارەسەرکردن و نەهێشتنی ئەو کەمو کووڕییانە تەرخان کرد، تا گەیشتە دروست کردنی بۆمبا لە جیاتی بەرمیل، کەڕێی بۆ هێرش بردن کردەوە لەماوە دوورەکانەوە، ئینجا چەکی کیمیاییکەیان دروست کرد کە شوێنکارەکەی هەمیشە زۆرترو بەردەوام تر بێت: وەك بەکارهێنانی گازی خەردەل یا گازی ئەلئیبریت (سولفۆر ٢ کلۆرۆ ـ ئیتیل) و «ئازۆتی خەردەلی» (هیدرۆ کلۆرۆری دوانی (بێتا ـ کلۆر ـ ئیتیل) ـ ئامین) وە لویزیت (دیکلۆرۆ ـ (٢ـ کلۆر فینیل ـ ئارسین)، ئەمانە هەموویان شلەن و دردنگ دەبن بە هەڵم، لەبەر ئەوە چەند کات ژمێرێك بە چالاکیو کاریگەری دەمێننەوە. گازی فۆسجین شوێنکارێکی کوژەری کوتوپڕی هەیە، بەڵام بەردەوام نییە، ئەم تەقەلایخۆ بە هێز کردنە گەیاندنییە ئەو پلەیەی کە بتوانن لە هێرشەکاندا چەند ماددەیەکی ژەهرینی جیاجیا یان بەتێکەڵ کراوی بەکار بهێنن، لەم بارەیاندا خۆپاراستنیش بەکڵاوە گازەکان زیاتر ئاڵۆز بوو، وە زیاتریش بەرەنگاری مەترسی دەبوون و ژمارەی کوژراوەکانیش زۆر بەرزتر بوەوە. بەراستی هێرش بردن بە بۆمبای «گازی خەردەل» ساڵی ١٩١٨ لە ناوچەی (ئیبەر ـ سان ـ کانتان) تەنها ٨٧ کەسی کوتوپڕ کوشت لە(٧٠٠٠) سەربازی بەرکەوتە، بەڵام ژمارەی ئەو سەربازانەی کەپاش ماوەیەك دوای بەرکەوتنەکە مردن یا ئەوانەی تووشی کەمو کوڕیو ناتەواویو دزێوی بوون بەهۆی هەڵمژینی گازی (ئیبەرەیت)ەوە زۆر زۆر لەوە زیاتر بوو.

لەجەنگی جیهانی یەکەمدا ١٩١٤ ـ ١٩١٨ چەکە کیمیاییەکان لهمەیدان: شەڕدا تەنها دژی کۆمەڵگە سەربازییەکان بەکاردەهێنراو، بەهیچ شێوەیەکیش دژی شارستانییەکان قەت بەکار نەهێنراوە. وەك دەردەکەوێت یەکەم کەسێ کە لە شەڕی حەبەشەدا گازی (ئیبەرەیتی) بێ جیاکاری بە شێوەی بۆمبا لەڕێگەی ئاسمانییەوە بۆ کۆمەڵ کوژی بەکار هێنابێت ئیتالییەکان بوون.

شوێنکاری ئەو گازانە لەسەرگەلی (ئەسیوپی)ی بێ دەرمەتان و داماو کە هیچ پارێزگەرییەکیان دژی ئەو گازانە نەبوو تارادەیەکی زۆر ترسناك و تۆقێنەربوو. هەر لەبەر هەمان هۆو چالاکیو کاریگەریی ئەوگازانە یابانییەکانیش دژی چینییەکان بەکاریان هێنا.

جەنگی جیهانیی دووەم بەوە لە جەنگەکانی کە جیا دەکرێتەوە کە گازە کوژەرەکانی تێدا بەکار نەهێنراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەردوو سەربازگە کە سوورو ئامادەبوون بۆ بەکارهێنانی، (لەوانەشە ئەو ئامادەبوونەی هەردوو لایەنەکە بووبێتە هۆی بەکار نەهێنانی). بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەم شەڕەیاندا تەنها هاتە سەر ماددە سووتێنەرەکان و ـ ها وێژراوە ـ ئاگرینەکان. بەڵام هەردوو لایەنەکە لەبەکارهێنانی بڕی یەکجار زۆری بۆمبای سووتێنەر بە فۆسفۆری سپی دژی شارەکان دریغییان لەیەکتر نەکردوە. ئەو فۆسفۆرە بەتینە لە ئەنجامی تەقینەوەی ناوەختەکەیەوە بەشێوەی گەردیلەی بچووك

دەردەپەڕێت و بڵاو دەبێتەوە، هەرکە هەوایش بەرکەوت دەست بەجێ گردەگرێت، ئەم گەردیلە گرگرتووە بچووکانەش برینی بەئـازارو پڕ سوێی ئەوتۆ لە لەشدا دروست دەکەن کە چاک بوونەوەیان کاتێکی دوورو درێژ دەخایەنێت.

بەڵام ئەم بۆمبا فۆسفۆرییانەش دیسانەوە سنووریان هەبوو، لەبـەر ئەوە گۆڕاو لەجیاتی ئەوە بۆمبای کانزایی سووتێنەر لە هاراوەیـەکی ووردی مەگنیسیـۆم و ئەلەمنیۆمی تێکەڵ کراوبە ئۆکسیـدی زنـك و ئاسن دروست کراو، تێکـەڵەکـەش زۆر وردکـارانە لە بۆمباکاندا دابەش دەکران تا مەبەستی دیاری کراو بهێنێتە دی.

لە ئەنجامی ئەوانەدا دەرکەوت کە چالاکترین ماددەی سووتێنـەر کە بتـوانـرێ لەوکـاتـەدا لەبـۆمبـاو هاوێـژراوە ئاگـرینـەکـانـدا بەکـار بهێنـرێت ناپـاڵـم، (کـە بریتییـە لە ئەوتـێـکـی خەسـت کراو بە سابـوونـی ئەلۆمـین و ترشی نافـتـالیـنـیـك و باڵمـیـتـیـك). ئەم جۆرە بۆمبایە سوپای سوێندخواران بەشێوەیەکی زۆر فراوان دژی یەکتـر لە شارەکان و لق و پەل و بنکەو سەربازگەکاندا بەکاریان دەهێنا، بەتایبەتی بۆ سەنگەرو قوڵە کۆنکریتییەکان.

ئەمریکا پاش جەنگی جیهانی دووەم لە کووریاو ڤێتنامدا ناپاڵمی بەکارهێنا، هەروەها فەرەنسییەکانیش لە جەزائیر بۆمبای ناپـاڵم شوێنکـارێکی وێرانکاریی ترسناکی بۆ سەر دوژمن هەیە: چونکە مرۆڤ دەکات بەشاپلیتەیەکی داگیرساوی زیندوو کە کوژانەوەکەی لەکارە نەکردەکانە (مستحیل).

وەك دەرکـەوتـووە ئەم ناپـاڵـمە تارادەیـەکی زۆر بەرز جێی ڕەزامەندی عەسکەرییەکانە، لەوانەیە بۆ بەهێزتر کـــــردنی شوێنکارەکەی هەندێك دەستکاری بکرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە گازە ژەهرینەکان لەجەنگی جیهانی دووەمـدا بەکار نەهێنراون بەڵام بە درێژایی ماوەی جەنگەکە هەرجێگـەی باس و لێکـۆڵینـەوە بوو. لەئەنجامدا ئەڵمانیا لەو بوارەدا، هەنگـاوێکی پێشکـەوتووی هونەری پیشەسازکردنی گرنگی نـا، ئەوەش: دۆزینەوەی بنەماڵەیەك بوو کەلەسێ گازی ژەهریـنی دژی دەمار پێکهاتبوو، ناونران (تابون، سارین، سۆمان).

ئەو سێ گازەیش لە (ئـۆکسیـدی فۆسفین) وەرگیرابوون و، بە ئاسـانیش لە ڕێگـەی کۆئـەندامی هەناسەو پێستەوە دەچنە لەشـەوە ئەگـەر بەشێـوەی دڵۆپی وورد بەر لەش کەوتن، بێ ئەوەی شوێنەکەی سوور هەڵگەڕێ یا هەو بکات وەیان ببێت بە بڵق. ئەم ڕێگـەی دوایی‌یـەیـان لە سمین و چوونە ژوورەوەی لەشدا زۆر گرنگە، جا لەبەر ئەوە پێویستە خۆپارێزی نەك تەنها هەر کۆئـەندامی هەناسە، بەڵکو پێویستە هەموو رووی لەش بگـرێتـەوە. وەلەبەر ئەوەی ئەم گازانە بێ بۆنن و نابنە هۆی وروژان و هەوکردن جا ئەو کەسـانـەی کە بەری دەکەون هەست بە بۆن و بەرکـەوتنـەکەی ناکەن تا زیاتر لە پێویست ماوەی بەسەردا دەڕوات و کار لەدەست دەر دەچێت. ئەوەی ئاشکـرایـە ئەم گازە ژەهـرانە بۆ کۆئەندامی دەماری زۆر پڕ مەترسییەو تەنانەت عەسکەرییەکانیش زۆر بەگران خۆیانی لێ دەپـارێـزن. خۆ بەهـەر شێـوەیـەکی تریش هەوڵ بدرێت بۆ پارێزگاریی شارستانییەکان ئەوە هەرمحاڵەو بەهیچ جۆرێك ناپارێزرێن. وە بەهەمان ڕێگەی بەکار هێنراو لە ساڵی ١٩٤٥ دا ماددەی ژەهرینی کەیان لە پێکهاتووەکانی پوختەی فۆسفات[٤] وەك ترشی دیالکیلا مینوالکیلتیۆ فۆسفۆریك و کاربۆنیلی کانزاکان بۆ سەر لیستەکانی گازە ژەهرینە دژە دەمارەکان زیاد کرد.

شوێنکـاری ئەوگازانەش هەر کوتوپڕ یان پاش چارەکە سەعـاتێـك دەردەکـەوێت. ئەوەش لەئەنجامی لێدان و لەکار خسـتـنـی کۆلینـیسـتـیراز Cnolinesterase ، کە هۆرمـۆنی سـەرەکی ڕێکخستنی دەماری ماسولکەکانە. وەلەبەر ئەوەی ئەم جۆرە گازانـە لەوانـەیـە لە هەشتـاکـانـدا بەکاربهێنرێت پێـویستە بە دوورو درێژی شوێنکارەکەی باس بکەین. وا لە خوارەوە بە پێی ئەو تاقـیکـردنـەوە تایبـەتییـانـەی کە بەپێشکـەوتنێکی پیشـەسـازییـانـەوە سوپـای ئەمـریکی کردوویەتی دوابەدوای یەك باسی دەکەین:

ئاو بەلووتـدا هاتن، سنـگ گیران، تەسـك بوونـەوەی

بیلبیلەی چاو، گران بینین و لێڵایی داهاتنی چاو، گرانی هەناسە وەرگرتن، لیک بەدەمدا هاتن و ئارەق کردنەوەی زۆر رەنگ تێکچون و لەش داهێزران، رشانەوە، ئازارو پێچ پیاهاتنی ریخۆڵە، میز بەخۆدا کردن و، پیسایی رانەگرتن و خۆپیس کردن بێ ئاگا لەخۆبوون، رەق بوونی لەش، کۆڵنج کردن، .

سەر سوور خواردن، سەر ئێشە، شێتی و ورێنە کردن، خاو بوونەوەو بێ توانایی لەش، بێهۆشیو بوورانەوە، چاو بەقولاچوون، وەستانی هەناسەو مردن. وە ئەگەر بۆ ماوەی یەك یان دوو دەقیقە پێست ئەو گازە بمژێت ئەوا ژەمی تەواو بۆ مردن وەردەگرێت و لێ دەبێتەوە، لەوانەشە مردنەکە سەعاتێك یان دوو سەعات بخایەنێت. خۆ ئەگەر ژەمێك بە هەناسە یان شلەکەی بچێتە چاوەوە لە ماوەی (١-١٠) دەقیقەدا دەیکوژێت.

ژەمێکی کوژەری گازی ساران (Sarin) ٣٠ سی جار لە ژەمێکی کوشندەی فۆسجین بچوکترە، کە پێش جەنگی ساڵی ١٩٣٩ بەچالاکترین گازی کوژەر دەژمێررا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژەمێکی کوشندە بریتییە لە (١ر٠)میلیگرام بۆ هەر کیلۆگرامێك لەکێشی مرۆڤ: واتە نزیکەی ٧ر٠ میلیگرام بۆ تەواوو ١ر٠ تا ٣ر٠ میلیگرامیش بۆ منداڵ.
لەوانەیە مژینی ژەمەکە بە گوێرەی مرۆڤێکی تەواوەوە لە ماوەی چەند خولەکێکدا تەواو ببێت ئەگەر چڕی گازی (ساران)ە کە لە ١ر٠ میلیگرامەوە تا ٣ر٠ میلیگرام بێت لە هەر لیترە هەوایەکدا، ئەگەر ئەو چڕییە گەیشتە ٢ تا ٤ میلیگرام لەیەك لیترە هەوادا، ئەوا ژەمە کوشندەکە بە مژینی یەك هەناسە تەواو دەبێت و مرۆڤ دەکوژێت. لەسەر ئەو ئەساسە دەتوانین ئەو چڕیی کوشندەیە لەهەوادا بۆ هەر شارێکی گەورەی وەك شاری پاریس لە ١٥ مەترە بەرزیدا بە بڵاوکردنەوەی نزیکەی ٢٥٠ تەن ماددەی ساران بهێنینە دی، ئەوەش بڕو قەبارەیەکی زۆر گەورە نییە ئەگەر بەگوێرەی برە پاشەکەوت کراوەکەی ئەڵمانیاوە لە ساران سەیری بکەین کە ٧٢٠٠ تەن بووە لە ساڵی ١٩٤٥دا. ئێستا زۆر بە ئاسانی ئەو (٢٥٠) تەنە بە هۆی (٢٠) تا (٢٥) فڕۆکەی بومبا هاوێژەوە دەگوێزرێتەوە، بێ گومان لە هەشتاکانیشدا بۆ هەمان مەبەست هەر پێویستمان بە نزیکەی هەمان ژمارە لە مۆشەك دەبێت.



لەگەڵ ئەو هەموو گۆرانانەی کە بەسەر گازە ژەهرینەکانی دژە دەماریدا هاتووە، هەواڵێکی گەورەش لە بواری ژەهرە دەروونییەکاندا (السموم النفسیة) دراوە، کە لە دواییدا دێینە سەر باسکردنی. هەروەها گۆرانێکی زۆر گەورەشیان بە سەر ئەو ژەهرانەدا هانی کە چالاکییەکی تەواویان دژی رووەك هەیە ـ وەك ئەو گازانەی کە گەلاڕێزان بە رووەك دەکەن و لە ڤیتنامدا بەکاریان هێنا بۆلەناوبردنی هەموو رووەکێك و بەروبوومێکی کشت وکاڵی لەناوچەی مەبەستەکەدا. وە ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە هەموو دەوڵەتە گەورەکان بەلایەنی کەمەوە هەوڵی ئەوە ئەدەن کە لێکۆڵینەوەکانیان چڕو تێرو تەسەل تر بکەن لە بواری جەنگە کیمیاییەکاندا.

هەر چەندە ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بە شێوەیەکی ئاشکرا لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەکرێت و ناوی لێکۆڵەرەوەکان و ژمارەی ئەو پارەیەی سەرفی دەکەن بڵاوی دەکەنەوە، بەلام لە هەندێ ووڵاتی کەدا زۆر بەنهێنی ئەو لێکۆڵینەوانە دەکرێت. جا لەبەر ئەوە ئێمە لەرێگەی

پروپاگەندەوە نەبێت نابینین و هەست بە بوونی تاقیگەیەکی نهێنی زۆر گرنگ ناکەین لە ئەڵمانیای رۆژ ئاوادا کە توانای بەرهەم هێنانێکی زۆر بەرزی هەبێتو تەنها بۆ کاروباری جەنگی کیمیایی‌ش تەرخان کرابێت.

ئەنجامی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەش ئاسایی زۆر نهێنی دەبێتو ئاشکرا نەکردنیش زۆر لە شاردنەوەی پێشکەوتن‌وگۆرانی چەکە ناووکیو ئەتۆمی مووشەکەکان ئاسانترە، چونکە لەوانەیە تاقی‌کردنەوەی چەکە کیمیایی‌یەکان بەشێوەیەکی زۆر کەمتر بەرچاو بکەوێت.

بەڵام تەقینەوە ناوکیو ئەتۆمی‌یەکان قەت لە توانای شاردنەوەدا نی‌یەو، هەروەها تاقیکردنەوەی مووشەکە دوور برەکانیش لە توانای شاردنەوەدا نی‌یە. بەڵام بۆ تاقیکردنەوەی چەکە کیمیایی‌یەکان دەتوانرێ لەچەند کەسێکی دیاری کراو بەولاوە کەسی تر پێی نەزانێت؛ ئەمەش دوو ئەنجامی هەیە:ـ

یەکەم: هەر دەوڵەتێك کە تاقیکردنەوەیەکی ناووکی یان ئاسمانی بکات بەرادیوو تەلەفزیۆن ئەوەی کردوویەتی بڵاوی دەکاتەوە.
دووەم: جەماوەرێکی گەورە لە گەلانی جیهان هەستەوەرییەکی بەرزیان دەربارەی چەکە ناووکی‌یەکان هەیە، بەڵام ئەوەندە، گوێ بە مەترسی‌یەکان جەنگە کیمیایی‌یەکان نادەن.

چاك وایە ئێمە تێبینی‌یەکانی خۆمان دەربارەی چەکەکانی تری وەك بۆمبا ئەتۆمی‌یەکان و مووشەکە دوور برەکان دووبارە بکەینەوە تا شارستانی‌یەکان بتوانن لەبەرهەمەکانیاندا لە کۆتایی گەشتەکەدا بەردەوام سوود لەو تاقیکردنەوانە وەربگرن کە عەسکەری‌یەکان لە کاتی گۆران و تاقی‌کردنەوەو بەجێهێنانە مەیدانی‌یەکان چەکبازیدا دەستیان کەوتووە، واتە «ئەوانەی بۆ خزمەتی شارستانی‌یەت سوود بەخشە نەك بۆشەر» بۆ نموونە لەوانەیە ئەم دووبارە کردنەوەیە بە گوێرەی هەندێ چەکی وەك: مووشەکەکانەوە راست بێت، دەتوانین ئەوەش بپرسین کە ئایا دەتوانرێ هەمان سوودمان بەکەمترین پارە تێچون دەست بکەوێت ئەگەر هەموو توانایەکمان تەنها بۆ وەدەست هێنانی سوودەکەی لە پێناوی پێشکەوتنی شارستانی‌یەتدا تەرخان بکەین؟! بەڵام ئەم دووپات کردنەوەیەش بەتەواوی هەڵەیە ئەگەر بمانەوێت لەسەر تازەترین دەستکەوتی جەنگە کیمیایی‌یەکان تاقی‌کردنەوەیان لەسەربکەین. ماددە دەرون سرکەرەکان لەسەرەتاوە بۆ مەبەستی پزیشکایەتی دروست کراون و، ژەهرە دژە رووەکەکانیش لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە کشت و کاڵی‌یەکاندا وەدەرکەوت و بۆ لەناوبردنی گژوگیای زیان بەخشەکان بەکار هێنرا. ئا لەم بارانەوە زۆر جوان بۆمان دەردەکەوێت کە لێکۆڵینەوە شارستانی‌یەکان بووە بە (هاندەر) بۆ لێکۆڵینەوەو بە کارهێنانی ئەو ماددانە لەمەبەستە عەسکەری‌یەکاندا. مەبەستیش تەنها لە تازەترین گۆراندا نی‌یە بۆ ئەو ماددانە، چونکە بەرهەم هێنانە پیشەسازی‌یەکەی کلۆرو فۆسجین بەهیچ شێوەیەك بەکارهێنانە عەسکەری‌یەکانیان تاوانبار ناکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەکارهێنانەکەیان لەشەردا بە هۆی بوونی ئەو ماددانەوە بووە لە بازاری پیشەسازیدا.

**هەڵبژاردنی توخمەکان:**
لێرەدا بەکورتی باسی ئەو عەمارە چەکە کیمیاییانە دەکەین کە ئێستا هەن و بەپێی مەبەستە سەرەکی‌یەکانیان ریزیان دەکەین، لەگەڵ دەست نیشان کردنی ئەو سوودانەی کە لەوانەیە دوا رۆژ لێیان وەربگیرێت.

**دژی خانوو بەرە:** ئەو چەکە کیمیایی‌یە ئامادە کراوانەی کە ئێستا دەیانبینین ماددەی سووتێنەرن، وەك: فۆسفور، ماددە هاراوە کانزایی‌یەکانی‌تر کە توانای ئۆکسید بوونیان هەیە، ئەمانەش چەکی زۆر بەهێزن و دژی ئەو وولاتانە بەکار دەهێنرێن کە زوربەی خانوو بەرەکانیان لە ماددەیەکی وا دروست کراوە توانای سووتانی هەبێت. بەڵام ئەگەر زوربەی خانووەکانیان لە کونکریتی شیش بەند دروست کرابێت و تەبەقە کانزای تێگیرابێت ئەوا ئەم چەکانە هیچ گرنگی‌یەکیان نامێنێت. جا لەبەر ئەوەی ئاراستەی گشتی‌ی زوربەی وولاتە تازە پێگەیشتووەکان ئەوەیە کە لەم جۆرە خانووە کۆنکریتی‌یانە دروست بکەن، کەواتە لەوانەیە ئیتر بەکارهێنانی ئەو ماددە کیمیایی‌یە سووتێنەرانە لە هەشتاکاندا بۆ چارە سەرکردنی هەربارێکی ئاڵوز لەو وولاتانەی کە لە پیشە سازکردنی

ولاتەکەیاندا گەیشتوونەتە قۆناغێکی بەرز لەشتێکی زۆرکەم بەولاوە هیچ سوودێکی لێ نەبینرێت.

**نموونەی دووەمی ئامانجەکە:** خەڵك، (الناس) لە قوڵە کۆنکریتی پەشیش بەندەکان و پەناگەکانی تردا: ئەو چەکەی ئێستا دژی ئەوانە هەیەو بەدەستەوەیە بۆمبای ناپاڵە: لەوانەشە لەهەمان کاتدا لەمەیدانی شەڕا دژی سوپا؛ وەیا لە شارەکاندا دژی دانیشتوان بەکار بهێنرێت. هەروەك لەپێشەوە ووتمان بێگومان ئەم ناپاڵە ئەمێنێ و بەردەوام دەبێت و تا دوا ڕۆژ بەهەمان ڕێگە هەر بەکار دەهێنرێت.

**سێیەم: تێکرای عەسکەریو شارستانی‌یەکان:** گازە ژەهرینەکان کاریگەرترین چەکن دژی هەر هەموویان. ئەم گازە ژەهرینانەش بەپێی مەترسی‌ی شوێنکارەکانیان وتوانای خۆپاراستن لێیان دەکرێن بەچەند بەشێکەوە، ئەوەیان کە لە هەموویان زیانی کەمترەو ویران کەر نی‌یە، فرمێسك ڕێژەکانە، وەك: کلۆر و ئەسیتۆفینۆن، چونکە شوێنکارەکەی کوتوپڕەو گازەکەش زوو بڵاو دەبێتەوەو لەکاتی شەڕیشدا بەهۆی کڵاو گازەکانەوە مرۆڤ دەتوانێ بەتەواوی خۆی لێبپارێزێت. ئەمەیان لە نموونەی ئەو جۆرە گازەیە کە دژی شارستانی‌یە بێ هۆی خۆپارێزی‌یەکان نەبێ کاریگەرانە دژی هیچ لایەنێکی تر بەکار ناهێنرێت، لەبەر ئەوە پێی دەڵێن «گازی دژە ئاژاوە». وە گازەر شینەرەوەکانیش وەك: ئادەمسیت Adam site لە کاریگەریدا هەروەك فرمێسك ڕێژەکانە: ئەنجامی هەڵژینی گازەکەش ترسی تێدا نی‌یە تەنها بۆ منداڵ و ئەو هەرزەکارانە نەبێت کە خۆراکی تەواویان نی‌یە.

کۆمەڵە گازێکی بەهێزتریش هەن و لەو گازانە پێکهاتوون کە پێیان دەڵێن «نەوتاوی» (منفطة)، وەك: (ئیپەرەیتی دلۆپێنراو و، خەردەلی ئازۆتیو لویسیت....هتد). ئەم جۆرە گازانەش دەبنە هۆی با کردن و سووربوونەوەی کۆئەندامی هەناسەو پاشانیش باری بەرکەوتەکە بەرەو خراپی‌و هەو کردنەوە و سووربوونەوەی سی‌یەکان و سك چوون دەچێت...هتد. ئەم گازانە بەئاسانی تاکوشتن و لە کارخستنێکی هەمیشەیی پەل و پۆی بە دەمەوەیە، تەنانەت بۆ لەش ساغەکانی تریش هەمان کاری هەیە، لێرەدا بۆ خۆپاراستن کڵاو گازەکان دەورێکی کاریگەریان هەیە، لەگەڵ ئەوانەشدا لە تواناداا هەیە گازە نەوتاوی یەکان بۆ ڕێگری لە جموجوڵی کەرت ولقە عەسکەری‌یەکان. بەکار بهێنرێن، چونکە لەسەرکردنی کڵاو گازەکان بۆخۆی دەبێتە ڕێگر. جا لەبەر ئەوە لە جەنگێکی نێوان دەوڵەتە گەورە پێشکەوتووەکاندا لەڕووی تەکنۆلۆژیاوە لەوانەیە نموونەی ئەم جۆرە گازانە لە هەشتاکاندا بەکار نەهێنرێن.

ئەم سێ نموونە گازانەی خوارەوە کوشندەن، تەنانەت بۆ ئەو هەرزەکارانەی کە تەندروستی‌یەکی زۆر چاکیشیان هەیە:

**١ ـ ئەو گازەی هێرش بۆ خوێن دەبات:**

ترشی کلۆریدریك، ترشی سیانیدریك و ئارسین (Arcines) بەیەکاچوونی دووگازیان لەگەڵ بەکارهێنانی ئۆکسجیندا بەیارمەتی هیمۆگلۆبین دەچنە خوێنەوەو خوێن ژاراوی دەکەن و و دەگەنە چەقە کۆئەندامی دەماری (الجهاز العصبي المركزي)، کارکردنەکەشیان بەگشتی کوتوپڕە.

ئەڵمانی‌یەکان بە تاقیکردنەوە کاریگەری‌ی ئەم دووگازەیان لە ژوورە گازی‌یە داخراوەکانی بەندیخانەیەکی سەربازگەیی‌دا سەلماند، لەم تاقیکردنەوەیەدا ترشی سیانیدریك (Acide Cyanhydrque ماددەی هاوچەشنی خۆی لەژێر ناوی (زیکلون ب)دا بەکار هێنرا، گازی ئارسینەکە لەگەڵ جوولەی خوێندا تێکەڵ دەبوو و هێرشی دەبردە سەر جگەرو هەردوو گورچیلەی. بەڵام شوێنکارە کاریگەرەکەی چەند کات ژمێرێك یان لەوانەیە هەندێك جار چەند ڕۆژێك بخایەنێت، لەبەر ئەوە بەکارهێنانی لە مەیدانی شەڕدا کاریگەر نەبوو، جگەر لەوەش بەکار هێنانی کڵاوە گازی‌یەکان لە مەترسی‌ی ئەوگازە بەتەواوی دەیپاراستن. وە لە لایەکی تریشەوە موستەحیلە ئەم جۆرە گازانە لە جەنگێکی گرنگی هەشتاکاندا بەکار نەهێنرێن. لەوانەشە دژی چەتەو یاخی بووەکان بیر لەبەکارهێنانی بکرێتەوە بەتایبەتی بۆ پاك کردنەوەی پەناگەو حەشارگەکان.

**٢) گازە «خنکێنەرەکان»:** فۆسجین و دایفۆسجین: ئەم گازانە

کار لە هەردوو سێیەکان دەکەن ودەبنە هۆی ئاو بەند کردنیاز (اودیما) و بەرکەوتەکە لە ئۆکسجین بێ بەش دەکەن و شوێنکارەکەیشی لە ماوەی سێ کات ژمێردا دەردەکەوێت، بەکارهێنانی کڵاو گاز بۆ خۆپاراستن لەم گازانە سوود بەخشەو بەکارە، بەڵام گازەکە بەشێوەیەکی چەسپاو لەهەوادا بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە، لەبەر ئەوە بۆ بەکارهێنانی لەهەشتاکاندا هێوایەکی زۆر کەم هەیە.

**٣)ئەوگازانەیکۆئەندامی دەماری ژاراوی دەکەن و پێشتر کەمێکمان لێ باس کردووە**:بەزۆری لەوە دەچێت لە هەشتاکاندا لەگەڵ گازە کوژەرەکانی تردا بەکار بهێنرێت.

بەرای عەسکەرییەکان گەورەترین جیاکەرەوەی گازەکان ئەگەر لەگەڵ تەقەمەنییەکانی تردا بەراورد کرا، ئەوەیە کە هێرشەکەی لایەنی دوژمن بەدانیشتوانی شارەکان و سەربازەکانی مەیدانی شەرەوە وەك یەك دەگرێتەوە بێ ئەوەی کەرەسەی تەقەمەنیو خانوو بەرەو دام و دەزگاکانی تر تێك بدات، ئەمەش گیرو گرفتی دروست کردنەوەی خانوو بەرەکان دوای کۆتایی شەر ناهێڵێت، چونکە ئەو جۆرە ئەرکانە سەرچاوەی هەموو بارێکی ئاڵۆزو گرانی دوای شەری جیهانیی دووەم بوون، ئەمەش بەگوێرەی پەیوەندیی ئەو جەنگانەوە کە بۆ مەبەستی داگیر کردنی زەوی تازە دەکران نرخ بۆ دانانێکی زۆر گرنگ بوو بۆ نیشتەجێ کردنی زیادەی دانیشتوان.

**٤) کۆمەڵەی چوارەمی مەبەستەکە: بەرهەمە کشت و کاڵیەکان و رووەکەکانە**:لەوانەیە ئەم مەبەستەیان ئامانجی سەرەکیو ستراتیژی بێت: لەناو بردنێکی تەواوی هەموو بەرهەمە کشت و کاڵیەکان بۆ بڵاوکردنەوەی برسێتی لە نێوان لایەنە شەرەکەی.تر، یا لەوانەیە ئەم ئامانجە پلان (تاکتیك) بێت بۆ داروخان و تێك شکانی ئەو پەناگەو حەشارانەی کە لایەنەکەی تر بۆ خۆشاردنەوە بە گەڵاو لقەدارو پووش پەلاش دایان پۆشیوە. زاناکان هەندێك لەو مادانەیان دۆزیوەتەوە کە پەیوەندیی بە هۆرمۆنی رووەکییەوە هەیە بۆ پاراستنی شارستانییەکان لە گژوگیا زیانبەخشەکان؛ وەك ترشی ٤و٢ ديکلۆرۆ غینۆکسیا سیتیك بۆ لەناوبردنی ئەو رووەکانەی کە لە گژوگیا دەچن، وەك ترشی (٥و٤و٢)ی دیکلۆرۆ فینۆکسیا سیتیك کە بۆ لەناوبردنی رووەکە ریشاڵییەکان زۆر کاریگەرە. ئەم ئاوێتانە بەکارییەکەیان گەیشتۆتە رادەیەکی بەرزی ئەو تۆکە: تەنها کیلۆگرامی بەسە بۆ لەناوبردنی گژوگیای ٢٠٠ مەتری چوارگۆشە. هەروەها دووجا کردنی ئەو برە بۆ رووەکە چێنراوەکان ژەهرە. ترشی دیمیتیلار سینیۆ لەوانی کە زۆر کاریگەر ترە: واتە ئەو برەی کە لەم گازانە بۆ لەناوبردنی هەموو ژیانێکی کشت و کاڵی و رووەك پێویستە؛ هەر بەقەدەر ئەو برە گازی (ئێیەرەیت)میە کە بەکارهێنانی هەموو مرۆڤایەتی لەسەر زەوی دەسڕێتەوە.

ئەم جۆرە مادانە لەرووی بەهێزییەوە دژی وڵاتە بچووکەکان یان چەتەو رێگرە تەریکەکان (العصابات المنعزلة) لەناوچەیەکی تا رادەیەك دیاری کراودا زۆر بەکارو کاریگەرە. بەلام بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییە گرنگانەی کە پەیوەندی بە وڵاتێکی کشت و کاڵی ئەو تۆوە هەبێت رووبەری زۆر بەرفراوان کشت و کاڵی تێدا بکرێت گومان لە بەکار هێنانی دەکرێت.

لەوەشدا پێویستە بە شێوەیەکی رێك و پێك بە ناوچە فراوانەکاندا بڵاو بکرێتەوە، ئەو مەبەستەش وەدی نایەت و کاریگەر نابێت ئەگەر فرۆکەی تایبەتی لە بەرزییەکی تارادەیەك کەمەوە بەکاری نەهێنێت، وەپێشەکی پێویستە دەست بەسەر ئاسمانی ناوچەکەدا بگیرێت، خۆ ئەگەر لەشەرێکی ئاساییدا ئەو دەست بەسەرا گرتنەش هاتە دی لەوانەیە سەرکەوتنەکەش لە کۆتاییدا دوور نەبێت، لەساڵانی داهاتویشدا ئەو گازانەی کە گەڵا رێژانی تەواو بەدارو درەختەکان دەکەن و ئەوانەشیان کە رووەکەکانی تر لەناو دەبەن و بنەبریان دەکەن تەنها دژی چەتەکان یا لەشۆرشە میلییەکانی تردا نەبێت بەکار ناهێنرێن، بەلام بۆ ئەو وڵاتانەی کە لە گۆران و پێشکەوتندان زیاتر چەکە زیندەوەرییەکان (الأسلحة البیولوجیة) بۆ بڵاو کردنەوەی نەخۆشییە کشت و کاڵییەکان یا سوتاندن پێش درەوکردن بەکارترن ئەگەر لە بەرزاییەکی زۆرەوە بەهۆی بۆمبا هایدرۆجینییەکانەوە بتەقێنرێن. توانایەکی تریش هەیە کە هێشتا تاقی نەکراوەتەوە، ئەویش «کون» کردنی چینی ئۆزۆنە لە ئاستی بەرگە بای ئەو

ناوچـە زەوی‌یەدا کە دوژمنی تێدایە، وەك زانراوە بوونی ئەو چینە ئۆزۆنەی کەتیشکە سەروی وەنەوشەیی‌یەکوژەرەکانی‌ڕۆژ دەمـژێت هۆی سەرەتـای بوونی ژیانە لەسەر زەوی، چونکە ژمارەیەکی گەورەی ماددە ئەندامی‌یەکان (المواد العضوية) کە یەکێکیان پرۆتیئیناتە ئەو ناوچەی شەبەنگە دەمژێت کە چینە ئۆزۆنەکە کاری تێکردووەو دەبێتە هۆی شی بوونەوەو نەمانی ئەو ماددانە، وەلەبەر ئەوەی کە خودی ئۆزۆنەکەش بەهۆی بوونی چەند پێکهاتویەکی ئەندامی‌یەوە کوتوپڕ بەربەرەکانی دەکرێت، جا لەوانەیە بە لایەنی کەمەوە لە ناوچوونێکی کەمی ئۆزۆنەکە لەناوچەیەکی بەرزی ۲۰ ـ ۳۰ کیلۆمەتری سەر ڕووی دەریاوە کە چڕی‌یـەکـەی زۆرتـرە بهێنێتـە دی، لەو بەرزی‌یـەشـدا دۆزەرەوە یـەکی گونجـاو (کـاشف ملائم) بلاو دەکـرێتەوە، دووریش نی‌یە ئەمەیان لە هەشتاکاندا بەکار بهێنرێت.

**ژەهرە دەروونی‌یەکان:**

هەرچـەندە سروشت تا ئێستا چاکترین ماددەی تایبەتی وەك پێویست بۆ کارێکی کیمیایی دیاری کراو دروست نەکردووە، بەلام بالێرەدا چاوێـك بەدوای ئەو چەکـانەدا بگێرین کە لەم دوایی‌یەیەدا خراونەتە سەر عەماری شەرە کیمیایی‌یەکان: ئەو ژەهرانەی کە پێیان دەلێن ژەهرە «دەرونی‌یەکان» یا ئاوێتەکانی بسیکـۆتۆمیمیتیك و عەسکەری‌یەکانیش ناویان ناوە (Incaps) واتە: گازە لە کارخەرەکانی کارە خۆویستەکان (الغازات الشالة للارادة)، تایبـەتمـەنـدە بۆ کارکـردنە سەرمێشك و ڕوودانی شێـوانێکی «کـاتی» لە مێشکی لایـەنـەکـەی تری شەڕ، چ لەمـەیدانی شەڕدا دژی سەربازەکان یان دانیشتوانی شارە دوور لە شەڕەکان.

ئەو سرکەرانە کە ئەم جۆرە شوێنکارانە دروست دەکەن هەزاران ساڵە لە لایـەن زۆر وولاتـانەوە ناسراون، بەشێوەی پوختـە کراو لە ڕووەکـەکـان یا گەڕووەکـان. بێ گومـان ئەم ماددانـەش لە هەمـوو جیهاندا بلاو بونەتەوە، بەلام وەك دەر دەکەوێت بە شێوەیەکی تایبەتی لە مەکسیکدا زۆرە. زانا لوین لە ساڵی ۱۸۸۸دا ئەوەی دۆزی‌یـەوە کە هیندی‌یەکان زۆر لە کۆنەوە پیشەیان جوینی «چرۆکانی مسکال» یان بیتۆل (PeyToL) بووە کە گەڵای وشکەوەکراوی کاکتوسـەو لە سەرێکە



سنـووری نێوان مەکسیك و وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا سەوز دەبێت، ئەم بەردەوام بوونـەیـان لەسـەر ئەو ڕەووشتە تووشی ورێنەو لە بیرچوونەوەیەکی زۆر بەهێزی دەکردن. ئەم پێکهاتووەی کە لە چالاکی دەرمانگەری‌ی دەرمانخانەکاندا بۆ پیتـۆل و مسکـالین گرنـگ و پێویست بوو لە ساڵی ۱۹۱۹دا دروست کراو هاتە کایەوە، لەبەر ئەوە بەرهەم هێنانی بڕی زۆر چڕی مسکالین ئێستا لە پیشەسازی‌ی کیمیاییدا کۆسپ نی‌یە، بەڵکو ئەوەی زیاتر گرنگ و پێویستە بڕی ژەمەکەیەتی لەبەکار هێنانی عەسکەریدا.

لەگـەڵ ئەوەشـدا جۆرەها ڕووەك و قارچکی ژەهراویش بەکار هێنـراوە، تا ئێستـاش هیندی‌یەکانی مەکسیك و، گواتیمالاو، بەرازیـل و، زنجی‌یەکانی هایتی‌و، دانیشتوانی گینیای تازەو، زۆر وولاتـانی تریش لە ئاهەنگی جەژنە ئایینی‌یەکانیاندا ئەو قارچـك و ڕووەکـانـە بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهێنن کە بیان گەیـەنێتـە بارێکی بێهۆشی‌و خۆ لەبیر چوونەوەیەکی ئەوتۆ کە ئاگایان لە بوونی خۆیان نەمێنێت، لێرەشدا دووبارە برو جۆری ئەو ژەمەی کە دەیانگەیەنێتە ئەو بارە تارادەیەك زانینی گرنگە

پێکهاتوویەکی جیاوازی تریش دۆزرایەوە کە زۆر لەو دەرمانانەی بسیکۆتۆمیمیتیك جیاوازترە کە لە گیانەوەرو رووەك دا هەیە، بەوەشدا لەوانی تر جیا دەکرێتەوە کە ئەتۆمەکانی ناوکێکیان تێدایە پێی دەڵێن « ئەندۆڵ» (لە هەندێ ماددەی زۆر بە کەڵکی تری وەك سیرۆتۆنیندا هەیە، وەك دەرکەوتووە بۆ راست رەویی کارەکانی مێشکی مرۆڤ زۆر پێویستە). بۆ نموونە ئەگەر بۆفۆتینین کوتوپڕ لە پێستی چەند بۆقێك دەربهێنرێت و بەدەرزی لە سەگێك بدرێت، ئەو سەگە گەمژەو گێژ دەبێت و توانای بەرگری کردنی لەخۆی نامێنێت.

ردگی درەختیلەیەکی ئەفریقی کە (تابرنانت ئیبۆغا)ی پێ دەڵێن ماددیەکی تێدایە پێی دەڵێن (ئیبۆغایین)، پێکهاتنێکی زۆر ئاڵۆزتری هەیە وەك لەپێکهاتنی دەرمانەکانی پێشوتر کە باسمان کردن، مرۆڤ توشی بێهۆشیو ورێنەیەکی بەهێزتر دەکات. هەوڵی زۆریش بۆ ئامادەکردنی ئەو پێکهاتنە ئاڵۆزە دراوە کە تائێستاش باسکردنی لەو مەیدانەدا بە تازە دەژمێررێت.

بەڵام بەهێزترین ژەهرە دەرونییە دوور کوژەکان (دیتیلامیدە ترشی لیسیرجیك)ە کە بەناوی ٢٥ـ LSD ، یان (ل س د)یەوە ناسراوە، ئەم ترشی لیسیرجیکەش بە شێوەی پێکهاتوویەکی کیمیایی لە جۆرە گیایەکی کۆمەڵەی گەنمدا هەیەو پێی دەڵێن (جەودەر) (Rye) ، پێکهاتنە پیشەسازگەرییە کیمیاییەکەشی بە گشتی لە ساڵی ١٩٥٤دا هاتەدی.

تا ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە بەرهەمەکانی ترشی لیسیرجیك تاقی کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە بە چاکی روون بۆتەوەو لە هەموویان کاریگەرتربووە هەمیشە (ل . س . د)یە، کە توانای دروست کردنی شێواندنێکی گشتیی لە رەوشتی مرۆڤدا هەیە بە ژەمێکی کەمتر لە مایکرۆگرامێك بۆ هەر کیلۆگرامێك لە کێشی مرۆڤ.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە (١/١٠) میلیگرامێك ئەگەر لە رێگەی دەمەوە بچێتە لەشەوە بەسە بۆ ئەوەی کەچاو بە تەواوی تووشی لێڵ بینیو رەشکەو پێشکە بکات و ئەقڵیشی بشێوێنێو تووشی جۆرە شێتییەکی وەك شیزۆفرانیای بکات. وەبە شێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین کە تەنها نزیکەی یەك کیلۆگرام (ل . س . د)ی بەسە بۆ تووشبوونی هەموو دانیشتوانی شاری لەندەن بە شیزۆفرانیایەکی (شێتی) کاتی (لە بارێکی ئەوتۆدا کە بە شێوەیەکی زۆر یەکسان بەسەر شارەکەدا دابەش ببێت بە مەرجێ یەك ملیم نەمێنێتەوە کە لەلایەن دانیشتوانەوە نەمژرێت، وە بری پێویستیش بۆ لە ناوبردنی تەواو لەو بارەدا لەیەك تەن زیاتر نابێت.....). ئەگەر بەکارترین رێگە بۆ ئەو دابەش کردنە ژەهراوی کردنی ئاوی خواردنەوە بێت، ئەوا هەڵمژینی ئەو (ل . س . د)یە لە شێوەی تۆزێکی ورددا دیسانەوە ئەنجامی زۆر چاك دێنێتە دەست. لە تواناشدا هەیە بە پرژاندنی (ل . س . د) لە رووبەرێکی زۆر فراواندا دانیشتوانی وولاتێکی بەتەواوی پێ ژەهراوی بکرێت و، لەرووی هونەری پێشکەوتنی پیشە سازیشەوە بۆ ئەمرۆ کارێکی ئاسانەو لە توانای کردندایە.

لە کۆنگرەیەکی پزیشکایەتیدا لە سەرکردایەتی گشتیی هێزەکانی پەیمانی ئەتلەسیدا (S. H. A. P. E.) فلیمێك نیشاندرا، دەربارەی رەوشتی کەتیبەیەکی سەربازگەیەك کە (ل. س. د)یان لەگەڵ چایی بەیانیدا دەرخوارد دابوون، سەربازەکان لە خۆیانەوە بە بێ هۆ تێکرا پێدەکەنین، چەکەکانیان فڕێ دەدا، بە هەموو شوێنێکدا هەڵدەگڕان، وەك منداڵ هاواریان دەکردو دەگریان، ئەوەش رەوشتێکی زۆر نائاساییە لە هەر سوپایەکدا بێت، چ شەرێکی سەیرە؟! چەند شەرێکی جوان و مرۆڤایەتییە؟!، لەوانەیە ئەو دیمەنە سەرەتای سەرەنج راکێشان بێت!، بەڵام کاتێ کە لە نزیکەوە بەووردی زیاتر سەرەنجی لێ بدەین؛ وەك دەر دەکەوێت دەبینین زۆر سەیرنییەو سیفەتی مرۆڤایەتیشی کەمتر تێدایە؟!.

ئەو جۆرە شێتییەی (شیزۆفرانیا) کە (ل. س. د)ی دروستی دەکات وا دەر دەکەوێت توانای پێچەوانە کردنەوەشی هەیە ئەگەر لەژێر چاودێری پزیشکدا ژەمی بدرێتێو، ژەمەکەش لە سنوورێکی زۆر کەمدا بێت. بەڵام لەوەشدا دیسانەوە شوێنکاری زۆر پر مەترسی رەچاو کرا، کە بە هیچ شێوەیەك لە توانای چاك کردنەوەدا نەما ئەگەر هاتو بەژەمی دوا بە دوای یەك وەرگیرا. لە شەرێکیشدا کەنیاز وابێت هەموو کەسێك ژەمێکی تەواوی بدرێتێ لەو برەی کە زیاترە لەو نوورەی لە توانای چاك بوونەوەدا بێت، ئەوا بەشێك لە دانیشتوان بەر ئەو ژەمە زیادمیە دەکەون، ئەوەش لەبەرکەوتەکەدا دەبێتە هۆی: یا

شێتی بەدرێژایی ژیان، وەیان مردن. بری ئەو ژەمەی بۆ کوشتنی مرۆڤێکی تەواو دانراوە بۆ منداڵێك یان بۆ ژنێکی سك پریش کوژەرە. بۆ زیاتر لێزانینی ئەو باسە، زاناکان لەم دواییەدا بڵاویان کردەوە کە (ل. س. د)ی سیفات و رەوشتی مرۆڤایەتی لە ئادەمیزادا دەسرێتەوە: واتە ئەنجامی سرینەوەیەکی نائاسایی (شاذ) لە رەوشتدا دروست دەکات و، رەوشت و شێوەی مرۆڤ دزێو دەکات و بۆ ناشرینترین باری روخساری دەگۆرێت.

لە کۆتاییشدا زۆربەری ئەو کەسانەی کە لەماڵی خۆیاندا بەو پەری ئارامەوە دانیشتوون و کەسانی تری گەریدەی کوچەو شەقامەکان کە (ل. س. د)ی یان بەر دەکەوێت، ژیانیان لێ دەشێوێت و لە خۆیانەوە پەلاماری هەموو ئامێرێکی میکانیکی دەدەن و ئیشی پێ دەکەن، وەك لێ خورینی قەمەرەو لۆریو شەمەندەفەر، لە خویانەوە گەلرەو (مسیرة) رێك دەخەن و چەکی زۆر پر مەترسی بەکار دەهێنن و فەرمان دەر دەکەن.

هەموو گیانەوەرە کێویو ماڵیەکان دەردەپەرن و تێکدەرژێن، لەو تێکرژانەشدا سنووری کاردانەوەی کاری ئەو (ل. س. د)یە لە چوار چێوەی هەستدا لە نێو ئەو ئاژاوەیەدا کە بڵاو دەبێتەوە رەچاو ناکرێت و، قەت لەو بروایەشدا نابین کە کوشتار روونەدات.

لە رووی بەهێزیشەوە زۆر لە چەشنە پێکهاتووەکانی وەك دەرمانەکانی بسیکۆتۆمیمیتیك فەحس کراوە، هەروەها بەرهەمەکانی ئەترۆپین و ترۆپان، وە ئەثیر (EThers) کە لە بیبیریدیل و ماددە نزیکەکانی وەك: «دیتران» (جلیکۆلات ١ـ ئیتیل ـ ٣ـ بیبیریدا یلسیکلو بنتیلفینیل) دەرهێنراوە. وە لەبەر ئەوەی کە لەرووی عەسکەرییەوە بەنهێنییەکی زۆر گرنگ گیراوە، روون کردنەوەی لەوە زیاتر دەربارەی ئەو ماددە سرکەرانە لە توانادا نییە.

تا ئێستا ئەو پێکهاتوانەی باسمان کردون قلۆیداتەکان (ALcaLoides) یان بەرهەمەکانیان بوون، واتە جۆرە ماددەیەکن کە ئازۆتیان تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە ماددەی تر هەن کە ئازۆتیان تێدانییەو کاریگی بەهێزتریش دەکەن: وەك قەننەبیات (القنبیات) (CannabinoLs)، لە زۆر دەمێکەوە ئەم بێهۆش کەرانە لە ئەمریکادا بەناوی (ماریجوانا)و، (گژوگیا) لە رۆژ هەڵاتی ناوەراستدا و، (کیف) لە باکووری ئەفریقا ناو بانگیان بەو شێوەیە دەر کردووە کە مرۆڤ تووشی حەسانەوەو خاو بوونەوەو هەست بە لوول خواردنی ئاسمان دەکات، ژەمی کاریگەری ئەم جۆرەیان لە ژەمی پێویستی (ل. س. د) زۆرترە، لەم بوارە شیاندا توانای هەندێك پێشکەوتن هەیە، چونکە ئێستا لە بارەی «گازە لە کارخەرەکانی کارە خۆویستەکاندا» زانستیی مرۆڤ بە شێوەیەکی زۆر گەورەو فراوان زیادی کردووە.

ئەو بێهۆشکەرانە هەموویان بە هەمان رێگەی (ل. س. د) کار لە گیانەوەر دەکەن، واتە دووچاری شێتییەکی کاتی دەبن و، تائێستاش بە تەواوی باسی سنوورو شوێنکاری ئەو گازانە روون نەکراوەتەوە، هەر لەو بروایەشدان کە لەوانەیە لەشدا کار بکاتە سەر ئەدرینالین، وە زۆر هۆی روون و ئاشکرای چاك هەیە وا لە مرۆڤ دەکات بروای بەوە هەبێت کە هەندێك لەو ماددانە وەك (بسیکوتومیمیتیك) کار دەکاتە سەر گۆرانی هاوتا بوونی ماددە بنەرەتییەکانی مێشك کە (ئەسیتیلکۆلین)ە، لێکدانەوەی کیمیای ژیان هەر چۆنێك بێت تەنها بەهەڵم کردنی پێکهێنەرەکانی بسیکوتومیمیتیك ئێستا لە توانایدا هەیە کە سەرانسەری دانیشتوانی وولاتێك ژاراوی بکات و بیبانخاتە گێژاوێکی فیکریی (Psychotique) ئەو تۆوە بە هیچ جۆرێك پەیوەندییان بە بوونی ژیانەوە نەمێنێت، لەو بروایەشداین لە ئێستەوە تاکۆتایی ١٩٨٠ پێشکەوتنی تازەتر وەدەست بهێنرێت.

لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ئەو گازەی عەسکەرییەکان بۆ لە کارخستنی کارە خۆویستەکانی مرۆڤ بەکاری دەهێنن بەناوی (BZ) وە ناسراوەو سیفەتی **راستەقینەکەشی هەر بەشێوەیەکی نهێنی ماوەتەوە، بەڵام لە کورتە پێشکەوتنێکی هونەری پیشەسازیدا سوپای (TM3 - 215) شوێنکارەکانی گازی BZ مان بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ دەژمێرێت:**

بەیەکدا چوونی چالاکییە سروشتییەکانی لەش، سووربوونەوەو وشك هەڵقرچانی پێست، دڵە کوتێ، مێزگیران، قەبزی، سست بوونەوەی چالاکییە سروشتیو ئەقڵییەکان، سەر ئێشە، سەر سوور خواردن، تێکچوونی ئاراستەی

ڕۆیشتن، ورێنەو هاوار کردن، خەواڵو بوون، هەندێ جاریش نیشانەی شێتی‌یەکی تەواو.

هەر لەو کورتەیەدا ئەم ئاگادار کردنەوەیەشی تێدایە کە «سنووری مۆڵەقە» (حدود حرجة) یەکێش لە بەکار هێنانی (ب . ز)دا هەیـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا بۆ ئەو ناوچانەی کەلقە شەر کەرەکانی هەردوولا بەیەکدا دەچن و شەڕ بەچەکی سپی دەکەن بۆ بەکارهێنان هەر بەچاك دادەنرێت.

لەوانـەشـە ژەهرە دەرونی‌یەکان لە شەڕی هەشتاکاندا بەکار بهێنـرێت، ئەگـەر بەتـایبەتی لە لایەن ژمارەیەکی زۆر کەمی کیمیـازانی زیـرەکـەوە بڕی پێویستی تەواو ئامادە بکرێت و، لەوانـەشـە لە لایـەن چەند گێرە شێوێنێکەوە لەشەڕدا بەکار بهێنرێت. ئەمەش هەر یەکێکە لەپێکهێنەرەکانی چەکخانەی کیمیایی.

چەکـە کیمیـایی‌یـەکـان هەر چەندە بەچاو زۆر کەمتر دەبینرێن وەك لە دیمەنی تەقاندنی بۆمبا ئەتۆمی‌یەکان و، وەك ئەوانیش سەرەنـج ڕاکێشــەر نین، لەبـەر ئەو هۆیـەش نا کە بەکـاری‌یـەکـەی لەوێـرانکردندا لەچری کاول کردنی ئەوان کەمترە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە لەپۆلێن کردندا لە هاوتای چەکە ئەتۆمی‌یەکاندا دادەنرێت لە رووی وێران کردنی گشتی‌یەوە، بۆیە پێویستە بەکارهێنانی بەتەواوی قەدەغە بکرێت و بخرێتە ژێـر چاودێـری‌یـەکی چڕەوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا کە دەزانـین چاودێـری کردنی - بێ‌گومان - کۆسپی زۆر گرانی دێتە ڕێ لەکاتی پشکنین و چاودێری کردندا، وەمانەوەی مرۆڤایەتیش لە ژیاندا بەستراوە بەو قەدەغە کردنەوە، لەناو بردنێکی تەواوی هەموو چەکە ئەتۆمی‌یەکانەوە.

ئەگەر بەراستی پلەی پربوونی تەواوی عەماری چەکە کیمیایی‌یە ئامادە کراوەکان بهێنینە پێش چاو، دەتوانین بیر لەوە بکەینەوە کە هیچ شتێك لەبواری پێشکەوتندا لەو رووەوە نەماوە بکرێت، بۆ بەد بەختی ئەوەش زیاد لە پێویست تێڕوانینێکی ڕاستـەو، عەسکـەری‌یـەکـانیش قەت لە بەدوا گەڕانی ئەو ماددانەدا ناوەستن ،، هەمیشە هەوڵی بەرهەم هێنانی چەکی زۆر ترسنـاکتر دەدەن. ئەوەی کە پەیوەندی بە نموونەی ئەم جۆرە چەکانەوە هەیەو لێرەدا نرخمان بۆ داناوە ئەوەیە کە هەوڵ بۆ پەیدا کردنی پێکهاتووی بەهێز بدەین بەو مەبەستەی کە لە گرنگی‌ی ژەمە کوشندەکە کەم بکەینەوەو تا ئەو پەڕی تواناش بەکـارهێنـانەکەی بۆ خۆ پاراستن ئاسان بکەین. وەسروشتی پێشکـەوتنـەکـەو دانـانی بنـاغەکەشی بە دوولا بەستراوە بە پێشکەوتنی «شارستانی‌یەتەوە»:

١- کیمیـای ماددە سروشتی‌یـەکـان. ٢- کیمیـای گۆڕانـە زیندەوەری‌و ئەقڵی‌یەکان. لەوەیاندا کە پەیوەندی‌ی بە پێکهاتنە ئۆرگانیکی‌یەکانەوە هەیە، گەیشتینە ئەو خاڵەی کە دەتوانرێ (ئـەگـەر پێویست ناچاری کردین) لەگەڵ گۆڕانی ڕێ ڕەوی پیشـەسازیدا بەچەند ساڵێك ئیش کردن دروستی بکەین، بە مەرجێك ماددە کاریگەرەکە سنووری ناسنامەو سیفاتەکانی بە شێـوەیـەکی گونجـاو بنـاسرێت و بە هیـچ شێـوەیـەکیش بەرهەمهێنانە پیشەسازی‌یەکەی ملی خنکان (عنق اختناق) پێك نەهێنێت.

بەڵام لەوەیاندا کە پەیوەندی بەماددە سروشتی‌یەکانەوە هەیـە، دەتـوانـین بڵێـین: ئەگـەر لێکـۆڵینەوەی پوختەی ئەو ژەهـرانـەی لە رووەك دەردەهێنرێن زۆر پێشکەوتو بێت، ئەوا پرۆگـرامی لێکـۆڵینـەوە بۆ ئەو ژەهرانەی لە گیانەوەران دێتە بەرهـەم هێشتا هەر لە سەرتادایە. بۆ نموونە: لە یابان جۆرە ژەهـرێك هەیە بەناوی (تۆرا فۆجۆ) Tora – Fugu وە ناسراوە، توخمێکی زۆر ژەهرین دێنێتە بەرهەم و توانای تووانەوەی لە ئاودا هەیەو پێ دەڵێن (تیترۆ دۆتۆکسین). پێکهاتووەکەی ئێستا هەیـەو، ژەمـە کوشندەکەشی بۆ مرۆڤێکی قەبارە مام ناوەندی نزیکـە ٠و٥ میلیگرامە. بێگومان زۆر ژەهری بە هێزی تریش هەیـە کە لە پوختـەی گیانەوەرە بێ بڕبڕەکان دروست کراوە، هەروەهـا ژەهـری رووەکـە دەریـایی‌یـەکان. وەتا ئێستا لەم بوارەیاندا هیچ لێکۆڵینەوەیەك نەکراوە.

لە کۆتایی‌دا دەربارەی ئەوەی کە پەیوەندی بە کیمیای ژیـانـەوە هەیە، پێویستە ئەوە بهێنینەوە یاد کە زوربەی ئەو گۆڕانـە ئاڵۆزانـەی لەنـاو لەشی مرۆڤدا روو دەدەن بەزۆری پەیـوەنـدی‌یـان بە شوێنکـارە لاوازەکـانی هەنـدێ زینـدە ماددەکـانـەوە هەیە، بەگشتی ئەوەش زنجیرەیەك کاردانەوەی

کاره بنـەرەتی‌یـە بەردەوامـەکـانی ژیـان دەگـرێتـەوە لەگەڵ بەردەوامی‌ی جووڵەی مێشکدا بە شێوەیەکی چاك و بێ خەوش، جا هەر شێوانێك لە هەر قۆناغێکی ئەو زنجیرە کارەدا روو بدات دەبێتە هۆی مردن یا تێکچوونی ئەقڵ. لە زوربەی ئاستەکاندا لەوانەیە ئەو بەیەکا چوونە (بەلایەنی کەمەوە) لە سەرەتادا روو بدات بەتایبەتی لەکاتێکدا کە هەندێك هەوێن خۆیان تێکەڵ بەو کارە دەکەن (وەك ئەم نموونەیە): ئەو گازانەی مێشك ژاراوی دەکـەن و لەمـەوپـێش باسـمـان کردوون، لەگـەڵ گازی (ئەسیتیلکۆلینستیراز)دا تێکەڵ دەبن. وە دۆزینەوەی ئەو ماددە ژەهرانەی کە ژەمە ژەهرینەکانیان دەگاتە چەند مایکرۆ گرامێك گران و کارێکی لە توانا بەدەرنی‌یە.

تا تێگەیشتن و لێکۆڵینەوەمان لە رێبازی کیمیای ژیاندا بەرەو پێشکـەوتن بڕوات، توانـای بەیەکا چوونەکانیش زیاتر دەگۆڕێت، لە بواری پزیشکایەتیو زیندەوەرزانیشدا هەوڵی زۆر بۆ رون کردنەوەی ئەو رێبازە زیندەگەری‌یە دراوە، لەوەشەوە فێری ئەوە بووین کە دەست بکێشینە ناو ژمارەیەکی ئەوتۆی ئەو ماددانەوە کە شایانی باسبێ، لەوانە: کاردانەوەی خۆ پارێزی (پاراستن دژی هەو کردن)، گەشە کردنی خانەکان و، دابەش بوونی خانەکان......، وە دۆزینەوەی ئەو ناوەندە ماددانەی کە بە توانان لە رێکخستنی بەرهەمی هەوێنە تایبەتی‌یەکاندا و بۆ گۆرانە زیندە گەری‌یەکانیش پێویستن، چەند خاڵێکی تازەی هێرش کردن دروست دەکـەن، وەك دۆزینـەوەی ئالۆستـیری: گۆرانی پێکهـاتنی تەنـۆلکـەیی هەوێنـەکـان بە هۆی چەنـد ماددەیـەکی کیمیـایی‌یـەوە، کە دەتوانێت بە ئارەزووی ئێمە چالاکی‌یەکەی زیادو کەم بکات.

زانستـە دەروونی‌یـە دەرمـانگـەری‌یەکان لقێکی تازەی زانستـەو، تەمەنی لە ٢٠ ساڵ کەمترە، بەلام ئێمە لە پێشەوە ئەوەمان دەزانی کە چۆن هەندێ شێواندنی وەك شیزۆفرانیا لە ئەقڵدا بوروژێنـین یان کەمی بکـەینەوە، هۆی چاکیشمان بۆ بیرکردنەوە بە دەستەوەیە کەوا پێشکەوتنێکی گەورە لەم بوارەدا لەم چەنـد ساڵانـەی دوایی‌یەدا تەواو دەبێت و دێتە کایەوە، هەرچەندە رێ رەوی ئەو پێشکەوتنە بەتەواوی ئاشکرا نی‌یە.

کەواتە بەلایەنی کەمەوە لەوانەیە داوو دەرمانی ئەوتۆی ووردو بەکـاری وا لە (ل. س. د)دا بدۆزێتەوە کە بەتەواوی توانای بەسەر دابین کردنی هەموو بارو گۆرانێکی ئەقڵیدا هەبێت.

لێکـدانـەوە ترسنـاکەکەی سروشتی مروڤ ئەوەیە کە: هەمـوو ئەنجـامێکی لێکـۆڵینـەوە پزیشکـایەتی‌یەکان و داوو دەرمـانـە دەروونی‌یـەکـان بۆ مەبـەستی مرۆڤـایـەتی بەکـار دەهێنـرێن، بەو ئاوات و ئامـانجـەی کە نەخـۆشی‌یەکان کەم بکەنەوەو ژیان بپارێزن، هەموو وەدەست هێنانێکی بنەرەتی‌ی کیمیـای ژیـان لە پێناوی رەزامەندی فیکرو پێویستی‌یەکانی زانیندا کەدێتە دی، لەوانەیە عەسکەری‌یەکان بەشێوەیەکی تر بەکار بهێنن، کەواتە لێرەدا دەتوانین ئەم پرسیارەی خوارەوە بکەین:

ئایا هەموو زانستێك نەفرەت لێ کراوە؟

بۆ وەڵامـەکەی پێویستە بڵێین: یا زانست ئەبێ لەناو ببرێت، وەیان شەر، ئەگەر هاتو بەنەمانی مرۆڤایەتی قایل بین!!.

تێبینی:

سەرچاوەی ئەم باسە کتێبی [الاسلحة الحديثة]یە، زانایان: ئەندریە بۆفر- ئەندرۆ ستراتۆن - هارڤ هویلر - م. هـ. ترێنغ دایان ناوە، بەلام لە ناوەڕۆکەکەیدا ئەم باسەیان نووسینی دوو زانای فەرەنسی‌یە کە ناویان: مارسێل فیتیزۆن - کیمیا زان - وە میشێل ماغات - کیمیای فیزیایی زانە - بە فەرەنسی ساڵی ١٩٦٨ لەفەرەنسەدا بڵاویان کردۆتەوە، لە ساڵی ١٩٧٢ یشدا اکرم دیری لە بیروت کردویەتی بە عەرەبی‌و بڵاوی کردۆتەوە.

١ - کۆرار: ماددەیەکە لەهەندێ رووەك دەردەهێنرێت، هیندی‌یەکانی ئەمریکا بۆ ژاراوی کردنی تیرەکـانیان بەکاریان دەهێنا، وە لەپزیشکایەتیشدا بۆ خاوبوونەوەی ماسوولکە بەکار دەهێنرێت. «وەرگێڕ»

- ئەم وتارە ساڵی ١٩٦٨ بەزمانی فەرەنسی لە فەرەنسەدا بڵاوکراوەتەوە. «وەرگێڕ»

- organophospheriques

- vesicants

●

# دووباره پیشەسازی کردنی[1] کۆنە پاشماوە پلاستیکی یەکان[2]


کۆمەڵی پلاستیکی کۆن و پاشماوە چاوەڕێی دووبارە کردنی پیشەسازی دەکەن


دوکتۆر زنون محمد پیریادی
پرۆفسۆری کیمیا ـ زانکۆی بەغدا
کۆلێجی زانست.



## پوختەی ووتار

بێ گومـان پاشمـاوەی کۆنـە پلاستیکی بێ کەڵك وەکو قوتوو وکـیـسـەو پارچـەی والا بووکـێـی منـدالان یان ئامـێرە پلاستیسکی یەکان زۆر بوەو، بوە بەگیرو گرفتێکی کاربەدەستان وشـارەوانی یـەکـان!! ئایـا چۆن لەم هەموو پاشماوە زیادەی پلاستیکـە رزگـار بن؟ مەتـرسی گەورەی مانەوەی ئەم ماددە پلاستیکی یانە لەوە دایە کە ماددەکە نارزێت وەکو سیلیلۆز[3] یان ماددە پرۆتینەکان[4]. زاناکان دەڵێن (٣٠٠) ساڵی ئەوێت بۆ رزینی پلاستیك وشی بوونەوەی بۆ پێکهاتوەکانی وتوخمەکانی[5]، ئەمـە لە لایـەکـەوە، لە لایـەکی ترەوە پلاستیکی کۆن جێگاو شوێنێکی زۆر دەگـرێت چونکـە زۆر بەیان لە شێوەی قوتوو سەنووق وکارتوونن.
لە ئەمەریکاو ئەوروپا ماددەی پلاستیکی زیادتر بەکار دەهێنن و زاناکان لەم چەن ساڵەی دواییدا رێگاو تەکنۆلۆجیای نوێیان دۆزیوەتەوە بۆ دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن و دروستکردنی شت وەکی بەسوود. ئەم ووتارە باسی چۆنێتی جێ بەجـێ کردنی ئەم جۆرە پرۆژەیـە دەکـات واتـە باسی تەکنۆلۆجیای دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستێکی کۆن دەکات.
دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن خزمەتێکی گەورەیە بۆ تەندروستی دەروو بەر[6] جگە لە کەڵك وەرگرتن و قازانج.


## پێشەکی

لە مێژەوە زاناکان و پسپۆرەکان دەروو بەر[7] بیرلە رێگایەك بۆ رزگار بوون لە پاشماوەی پلاستیکی کۆن دەکەنەوە. پلاستیك ماددەیەکی کیمیایی[8] دەستکردە لە چلەکان و پەنجاکانی ئەم چەرخـە زۆربـەیـان دروست کران. ئەم رۆکـە بەکار هێنانی ماددەی پلاستیك بە جۆرێك زۆر بوە ئەتوانین بڵێین هەر چی ئامێرو شت و مەکی ناوماڵ هەیە هەمو پلاستیکە.. کەوچك، چنگال، قاب، سینی، پەردا غ، ئەسکەمیل، مێز، بەفرگر، فریزەر، رادیوو وتەلفزیۆن و دەیەها شت و مەك و ئامێری تر گشت لە پلاستیك دروستکراون.
هەنـدیـك جار بەم چەرخـەی تیـایدا دەژین دەڵێن [چەرخی پلاستیـك[8]] لەبـەر زۆر بەکـار هێنانی پلاستیك. بێ گومان پلاستیك گەلێك سوودی هەیە بەسەر ئاسن و مس و فافۆن دا

بۆ وێنە پلاستیك[9] زۆر ماددەیەكی سووكە. ئەم سیفەتەش زۆر بە نرخە بۆ دروستكردنی ئامێرو فڕۆكەو پاپۆڕو باڵۆن و گەلێك شتی تر. سیفەتێكی گرنگی تری پلاستیك ئەوەیە كە ژەنگ هەڵنا گرێت و بەئاو زۆر جوان دەشۆرێت. ئەمانەو گەلیك سیفەتی تریش هەن كە هاووڵاتی‌یەكان پلاستیك پەسەند دەكەن زیادتر لە ئاسن و فافۆن یان شوشە. بۆ وێنە پلاستیك ئەگەر كەوتە عەرد ناشكێت وەكوو شوشە ئەمەش سیفەتێكی دەگمەنە بۆ دروستكردنی شت و مەكی منداڵ وەكوو مەمەی شیریان بەرداغی ئاوخواردنەوەی یان شتی تر.

بۆیە دەبینین هەتا دێت بەكار هێنانی پلاستیك لە ژیانمان دا زیاد دەكات و هەموو رۆژێك چەشنی نوێ دێتەكایەوە.

## بەكار هێنانی پلاستیك لە ئەمەریكا

ئەمەریكا یەكەم وڵاتە لە بەكار هێنانی وپلاستیك و دروستكردنی. بەڵام گیرو گرفتێكی گەورەی ناوەتەوە چونكە كۆنە پلاستیكەكان ڕزیوەكان زۆر بوهو بە كۆمەڵی گەورە شوێنێ زۆری داگیر كردەوە. ساڵی (٣٢٠) بلیۆن كیلۆ[10] لە پلاستیكی كۆن وپاشماوەی كارگەكان و ماڵەكان فرێ ئەدرێت ونازانن چی لێ بكەن وچۆن دەروبەر رزگار بكەن لێی؟ (سەیری وێنە ـ ١ بكە).

بۆ سوود لێ وەرگرتن لەم پلاستیكە كۆنە و هەمیشە رزگار كردنی دەرو بەر زاناكانی كیمیا[11] لە ئەمەریكا ڕێگاو تەنكنۆلۆجیایان دۆزیوەتەوە بۆ دووبارە بەكار هێنانی ئەم پلاستیكانەو پیشەسازی كردنیان.

لە ساڵی (١٩٧٨)ز بۆ وێنە كارگەكان (٢٧) بلیۆن كیلۆ پلاستیكی تازەیان پیشەسازی كردوەتە جۆرەها شت و مەك ناردویانە بۆبازاڕ. لەم (٢٧) بلیۆن كیلۆ پلاستیكە (٢٢) بلیۆن كیلۆی فرێ دراوەتە زبڵخانەكان وەكو قوتوو كیسەو شتی تری پاشماوە.

پسپۆرەكان دەڵێن لە ساڵی (٢٠٠٠)ز بەرهەمی ماددە پلاستیكی‌یەكان لە وانەیە بگاتە (٣٧) بلیۆن كیلۆ غرام. لەم قەبارەیە هاووڵاتی‌یەكان (١٩) بلیۆن غرام پاشماوەیان دەبێت و فرێ ئەدرێت. ئەمەش دەكاتە (١٠٪)[12] هەموو ماددە پاشماوەكان بەگشتی.

بەراستی گیروگرفتی كۆنە پلاستیك برێتی‌یە لە قەبارەكەیان[13] چونكە شوێن ورێیەكی زۆر داگیر دەكەن، چونكە شتەكان هەموو لە چەشنی قوتوو كارتۆن و سەنووق وشتی فشن[14].

تەكنۆلۆجیای نوێ بۆ دووبارە پیشەسازی كردنی پلاستیكی كۆن برێتی‌یە لە جیا كردنەوەی جۆرەكانی پلاستیك لە پێشا، بۆ وێنە فوتوی بولی (ئەثیلین تێر فتالات) كە بەكورتی ناوی دەنێین بە (PET) پاگژ دەكرێنەوە و جیادەكرێنەوە لە پلاستیكی بولی ئەثیلین (PE) یان بۆلی ستاریرین poly (styrene).

پرۆژەی[15] دووبارە پیشەسازی كردنی پلاستیكی كۆن لە چەن شوێنێكی ئەمەریكادا دەستی پێ كردوە. هەر وەها تەكنۆلۆجیای تایبەتیش داهێنراوە بۆ گەڕاندنەوەی فافۆنی كۆن یان كاغەز لە ناو پاشماوەو زبڵ و خۆڵی شارەكان.

سروشتی‌یە گیروگرفتی كۆمەڵ بوونی كۆنە پلاستیك مەسەلەیەكی نۆی نییە لە ئەمەریكا. ئەتوانین بڵێین لە حەفتاكانەوە بەم لاوە پسپۆرەكان دەرو دەووبەرو هاووڵاتی‌یەكان بەر دەوامن لە بیر كردنەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەك و تەكنۆلۆجیایەك بۆ پیشەسازی كردنی پلاستیكی كۆن و سوود وەرگرتن لێیان هەمیشە رزگار بوون لە كۆمەڵەكانیان.

دوا یاسای میری دەربارەی ئەم مەسەلەیە یاسای ژمارە (٥٠٠)ی شاری نیویۆركە، ئەم یاسایە نوێنەری نیویۆرك پێشنیاری كردوەتە كۆنگرێی ئەمریكی[17] بەم ناو نیشانەی خوارەوە:

«یاسای دووبارە پیشەسازی كردنی ماددە زانستی‌یەكان[18] و تەكنۆلۆجیای پێویست بۆ جێ بەجێ كردنی».

یەكەم كارگەی دووبارە پیشەسازی كردنی پلاستیكی كۆن لەم شوێنانەی خوارەوە لە ئەمەریكا دەستی پێ كردوە:ـ

١ ـ رۆد آیلەند Rhode Islond

٢ ـ نیو جەرسی New Jersey

٣ ـ كالیفۆرنیا California

پاش ساڵی ١٩٨٧ ولایەتی ماسوسییس[19] Massa Chusetts .
لەگەڵ ولایەتی رۆد آیلەند Rhode Island بە یەكەوە یاسایەكی دووقۆڵیان دەربارەی پرۆژەی دووبارە پیشەسازی كردنی

پلاستیکی کۆن دەرکـرد. ئەم پرۆژەیــە ٢٥٪ی پاشمــاوەی پلاستیکی پیشــەسازی دەکات و دوو بارە دەکرێن بە شت و مەکی بە کەڵك.

## چ جۆرە پلاستیکێ دووبارە پیشەسازی دەکرێت؟

### ماددەی پلاستیکی دوو جۆرن:-

١ - پلاستیکی گەرمك[٢٠] Thermoplastie Resin .

ئەم جۆرە پلاستیکە هەرزانە و لە پلەی گەرمی ئاسایی‌دا رەقە بەڵام لە پلەیەکی بەرز تر وەکوو پلەی ٩٠س یان ١٠٠س یان زیاتر پلاستیکەکە نەرم دەبێت، و ئەگەر گەرمایی‌یەکە زیاد بوو ئەوا پلاستیکەکە شل دەبێتەوە وەکوو ئاو. ئەم شلە بەساردی بەرە بەرە تون دەبێت و رەق دەبێتەوە. گەلێك شت و مەکی ناو مال لەم جۆرە پلاستیکـە دروست دەکـرێت وەکـو: پەرداغ و کەوچـك و قاب ویان قوتوو و عینەك و کیسەو کارتۆن و یاری منداڵ. شیانی باسە ٨٧٪ی پلاستیك چەشنی پلاستیکی گەرمکە.

٢ - پلاستیکی دژ بە گەرما Thermo setting plastie

ئەم چەشنە پلاستیکە تازەیەو نرخی گرانترە لە جۆری یەکەم ئەم جۆرە پلاستیکە بە گەرم کردن نەرم نابێت وئەگەر زۆر گەرم کرا شی دەبێتەوە و دەبێت بە هەڵم و زوخاڵ. ئەم پلاستیکە لە جۆری یەکەم دروست دەکرێت و بۆ ماکینە و بەفر گر وجل شۆر وشت و مەکی متبەق کە لە شوێنی گەرم بەکار دەهێنرێت بەسوودن.

شیــانی باســە پلاستیکی جۆری دووەم واتە (دژ بە گەرمی) دووبــارە پیشەسازی ناکرێتەوە چونکە شل نابێتەوە بە گەرما بەڵام پلاستیکی جۆری یەکەم ئەتوانرێت دووبارە کۆبکرێنەوەو. بە هۆی گەرمی شل بکرێنەوەو بکرێن بەشتی بە سوودی نوێ.

شەش جۆر لە پلاستیکی گەرمك دروست دەکرێن لە ئەمەریکا و باون لە ناو هاوولاتی‌یەکان. شەش جۆرەکان لە خوارەوە دەنووسین:-

١ - پۆلی ئەثیلینی کەم چر (Low Density polyethylene (LDPE)

٢ - پۆلی ئەثیلینی بەرز چر(High Density polyethy lene) .

٣ - پۆلی ستایرین poly styrene .

٤ - پۆلی پرۆپیلین POLYPROPY LENE .

٥ - پۆلی ئەثیلیی تێر فثالات (poly (ethylene terphthalate .

٦ - pve واتە پۆلی (کلوریدی ڤاینیل) (polu (vinyl Chloride .

وێنــە - ٢ - لە خوارەوە ریـژەی بەکـار هێنـانی هەر جۆر لە جۆرەکانی سەرەوە نیشان ئەدات:

PS – poly styrene

PP – poly propylene

PET – poly (ethy lene terphthalath)

PVE – poly (vinyl chloride)

پلاستیکی پۆلی ئەثیلین لە هەمــوو جۆرەکانی تر زیادتر بەکار دەهێنرێت. کەچی HDPE بۆ دروسترکردنی شت و مەکی رەق بەکەڵك دێت وەکوو قوتو و قاب و ودۆلکەی ئاو و کەوچك ودەوری وشانە وعەینەك. بەڵام پلاستیکی LDPE بۆ دروستکردنی شتی نەرم بەکار دهێنن وەکوو کیسە[٢٣] و پارچەی گەورە بۆ مەبەستی کشت[٢٤] وکاڵ.

پلاستیکی PET بۆ دروستکردنی قابی شەربەت و ساردەمەنی بەکار دەهێنرێت. بەڵام PS دەکرێت بە پەرداغ پاش ئەوەی بە تەکنۆلۆجیای تایبەتی پلاستیکەکە کوناوی دەکرێت. پلاستیکی کونــاوی[٢٥] (یــان کونـدار) بە ئنگلیـزی پێی دەڵێن (Foam) ماددەیەکی تازەیە لە جیهانی پیشەسازی پۆلیمەردا وزۆر بەی بەرهەمیان بۆ پێچین[٢٦] وپاریزگاری شوشەو ئامێری کارەبایی ناسك لە شکاندن بەکار دەهێنرێت.




ریژەی بەکار هێنانی جۆرەکانی پلاستیك بۆ پێچن لە ئەمریکا ساڵی ١٩٨٧

شیانی باسه مادده ئیسفەنج لەم چەشنە پلاستیکە دەژمێرێت.
ماددەی (Pve) پلاستیکێکی رەق و بە هێـزە بۆ دروستکردنی شتی قورس و سووك بەکار دەهێنرێت. پۆلی پروپیلین[٢٧] (PP) بۆ جۆرەها شت و مەك دروستکردن بە سوودە.
لە ساڵی ١٩٨٥ یەکـەم تاقیگـەی تایبـەتی[٢٨] دامـەزراوە بۆ لێکـۆڵینـەوەی گیرو گرفتی پاشمـاوەی پلاستیکی لە زانکۆی رەتگـەرس لە ئەمـەریکا. سێ ملیۆن دۆلاریان بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخان کردوە.
پاش دوو ساڵ لێکۆڵینەوە ئەم دەزگایە واتە دەزگای (CPRR) راپـۆرتێکی ئامـادە کرد بۆ چۆنێتی دووبـارە پیشـەسـازی کردنەوەی پاشماوەی پلاستیکی کۆن. سێ و چوار لەم راپۆرتانە گەیشتنـە پلەی تاقی کردنەوە لە کارگە. بەم جۆرە پلاستیکی کۆن کۆدەکـرێتـەوە و بە هۆی تەکنـولوجیـای نوێ دووبـارە دەکرێنەوە ئامێر و شت و مەکی بەسوود.

## چۆنێتی دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن

لە راستیدا دوو چەشن رێگـاو تەکنـۆلۆجیا هەیە بۆ دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن لە ئەمەریکاو ئەوروپا وژاپۆن:-
١ - رێگای فیزیایی.
٢ - رێگای کیمیایی

**١ - رێگای فیزیایی. ئەم رێگایە لە سەرەوە باس کرا. یەکەم قۆنـاغی لەم تەکنـۆلۆجیـایە بریتی‌یە لە جیا کردنەوەی پلاستیکە کۆنەکان.**
**بۆ وێنە قوتوی**[٢٩] (PET) بەجیا کۆمەڵ بکرێن و پلاستیکی (PE بەجیا. جیا کردنەوەیان بە دەست جێ بەجێ دەکەن یان بە مەکینە. لە پاشان قوتوەکان ورد دەکرێن ودەهارێن. هاراوەکە دەبەن ودەیخەنە بەر لووزەیەکی[٣٠] با بۆ ئەوەی ئەگەر ماددەی سووکی غەریبی تیادا هەبێت بایەکە جیای بکاتەوە.
نەقش و نووسینی سەر قوتوەکان بە هۆی دەرمانی تایبەتی لا ئەدرێن. پوختەی قسەکانمان ئەوەیە کە ماددە پلاستیکی‌یەکان جیا دەکرێنەوە بۆ چەشن و جۆری خۆیان. واتە ئەو ماددانەی کە لە چەشنی[٤٩] (PET) تن بە جیا و ئەوانەی لە چەشنی (HDPE)[٣١] تن بە جیا. هەر وەها ماددەکان تریش بە جیا وکوو فافۆن وشتی تر.
ئەم ماددە جیا کراوانە دەفرۆشرێنە کریاری تایبەتی، ئەوانیش بەکاری دەهێنن بۆ دروستکردنی شت و مەك.
وێنـە - ٣ - کارگەیەکی دووبارە پیشەسازی پلاستیکی کۆن نیشان ئەدات.



کارگەیەکی دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن

٢ - رێگای کیمیایی[٣٢].
ئەم رێگـایـە بۆ دووبـارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن کەمتـر باوەو تەکنۆلوجیا کەی بە تەواوی جیایە لەگەڵ رێگای یەکـەم. ئەم رێگایە پشت دەبەستی بەکارلێکی کیمیایی[٣٣] بۆ جێ بەجێ کردنی مەبەستی.
یەکەم کومپانیا کە ئەم تەکنۆلوجیایەی تاقی کردۆتەوە کومپانیای (ئیستمـانـە) Eastmon Chemicals لە ئەمـەریکـا. دوای ئەو کومپانیای (فریمان) Freeman Chemieal Corp (دیسأننەوە لە ئەمـەریکا) ئەم جۆرە تەکنۆلۆجیای پەسەند کردوە بۆ دووبارە پیشەسازی پلاستیکی (PET) ی کۆن.
ئەوەی راستی بێت ئەم تەکنـۆلۆجیـایـە پلاستیکی کۆن شی دەکـاتـەوە بۆ ماددەی بچـووك، لە پاشـان سوود لە ماددە بچووکەکان وەردەگرێت.
بۆ وێنە پلاستیکی (PET) شی دەکرێتەوە بۆ پۆلیۆل polyol لەگەڵ

بۆلیمــەری نەتێر. پۆلیۆل بە کەڵك دەهێنرێ. بۆ دروستکردنی پۆلی یوریثانی[٣٤] سووك و کوناوی.

کومپــانیای[٣٥] Eastman Chemi Cals پلاستیکە ...تی PET شی دەکــاتــەوە بۆ ترشی تێر فثــالیــك ...erphthalie acid لایکۆلی ئەثیلین لەگەڵ پۆلی (ئەثیلین تێر فثالاتێکی) (PET) گەر ...وك.





$m < n$

لە سەتــا پەنجای (٥٠٪) ماددە پلاستیکە سووکەکان کە بۆ پێچانەوەو پارێزگاری شووشەو و ئامێری کارەبایی ناسك لە ناو کارتۆن دا بەکار دەهێنرێن بەم تەکنۆلۆجیایە جێ بەجێ دەکرێت.

شیانی باسە ئەو پۆلیمەرەی کە دەمینێتەوە لە چەشنی (PET) پاش کارلێکــردنــی کێشی گەردی کەمتــرە لە کێشی جارانی ولەوانەیە بە سوود بێت بۆ دروستکردنی هەندیك شت و مەك.

تەکنۆلۆجیای تایبەتی هەیە بۆ دووبارە پیشەسازی کردنی دوو یان سێ جۆر پلاستیك بە شێوەیەکی تێکەڵ. بۆ وێنە لە بەلجیکا تەکنــۆلۆجیــای تایبــەتی دۆزراوەتــەوە بۆ پیشەسازی کردنی پلاستیکی تێکــەڵ. نەك هەر پلاستیکــە کۆنەکان هەمە جۆرن بەڵکــو ڕێژەیەکی زۆریش لە ماددەی غەریبی تیادایە وەکوو کاغەز، پارچە شوشە، کانزای هەمەجۆر، و خۆڵ وپیسی.. هتد.. هەندێك جار ڕێژەی ئەم ماددە ناپلاستیکییانە (واتە شوشە و فافۆن و خۆڵ..هتد) دەکاتە ٤٠٪ تێکەڵەکە.

پلاستیکی دووبــارە دروستکــراو بۆ گەلێــك مەبــەست بەکار دەهێنرێت وەکوو دروست کردنی کورسی و مێزی سەیرانگاکان وتاسەی دەستکرد[٣٦]

لە ئەمە ریکاش کومپانیایەکی نۆی دامەزراوە بەناوی (بەرهەمی پۆلیمــە) polymer products لە شاری ئایــاوا (Iwa) ئەم جۆرە شتانە دروست دەکات لە پلاستیکی کۆن و بەنرخێکی هەرزان دەیفرۆشێت.

هەروەهــا لە ولایــەتی نیــوجــرسی New Jersey لە ئەمــەریکــا



تاسەی دەستکرد بو وەستانی ئۆتوموبیل
لە پلاستیکی کۆن دروست دەکرێن

کومپــانیــای ویلمــان Willman قوتــوی پلاستیکی (PET) کۆ دەکاتەوە و دووبارە پیشەسازی دەکاتە کووتاڵ[٣٧]

لە ساڵی ١٩٨٨دا (٧٥) ملێــون کیــلۆ لە (PET) ی کۆن کۆکراوەتەوە و دووبارە کراوەتە کۆتاڵ.

ئەگەر هاتوو پلاستیکی (PET) لەگەڵ کحوولی مەثیلی[٣٨] کوڵاندرا ئەوا کارلێکی کیمیایی دەکەن و پۆلیمەری (PET) شی دەبێتەوە بۆ گلایکۆلی ئەثیلین و ئیستەری دوومەثیلی تێر فثالات بەگوێرەی هاوکێشەی خوارەوە





ئەگەر سەیری ڕێبازی دوو بارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆنە بکەین کە لە plastic bottle Recycling Directory and Reference Guide ساڵی ١٩٨٨ دا چاپ کراوە لەلایەن ئامۆژگای قوتووی پلاستیك[٣٩]

دەخوێنینەوە تیایایدا کە:
٦٧ کومپـانیـا لە ئەمەریکادا هەیە کە خەریکی کۆکردنەوەو دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆنن.
٥٠ کومپانیا هەیە لە ئەمەریکا کە کۆنە پلاستیك دەکرن.
٥٤ کومپانیا هەیە لە ئەمەریکا ئامێرو شت و مەکی بەسوود لە پلاستیکی کۆنە دروست دەکەن.

بێ گومـان دامـەزرانـدنی ئەم کارگـە تازانـە بۆ دووبـارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن گەلێك ئیش و کاری نوێی بۆ هاوولاتیـیەکـانی دۆزیـوەتەوە. یەکێك لەم دەزگایانەی کە پەیوەندی هەیە بەو کارگانەوە دەزگایەکە بە ناوی NAPCOR واتە:

The National Association For Plastic Container Re Covery

ئەم دەزگـایـە (١٢) کارگـەی هەیـە لە شارەکانی ئەمەریکا، هەمـ ـیـان پلاسـتیکی کۆن بە تایبـەتی (PET) دووبـارە ـسازی دەکەن.



پلاستیکی تایبەت بە پۆشینی ئەرزی ناو مال لەجیاتی کاشی ـ لە پاشماوەی (PET) دروست دەکرێت.

لە کۆتایی باسەکەمان ناوی چەن کومپانیایەکی تر ئەنووسین کە تازە دەستیان داوەتە پیشەسازی کردنی پاشماوەی پلاستیك.

**١ ـ کومپانیای مۆبیل** Mobil Chemi Cals.

ئەم کومپـانیـایـە بە شێوەیەکی سەرەکی پۆلی ئەثیلین و پۆلی ستـایرین دروست دەکات. بەلام هەمیشە پلاستیکی کۆنیش دەکـرێت و بە تەکنـۆلۆجیـای تایبـەتی کومپانییەکە دووبارە دەیکەنەوە شت ومەکی بە سوود. جگە لەمە سالی (٥٠) ملیۆن کیلۆ لە پلاستیکی پۆلی ئەثیلینی کۆن و رزیـو دەکـرن و بەکـاری دەهێنن بۆ پیشەسازی پەرداغ وشتی تر.

**٢ ـ کومپانیای جێنپاك** Genpak.

کومپانیایەکی ناسراوە بە پیشەسازی کردنی ماددە پلاستیك. دەستی داوەتە کۆ کردنەوەی پلاستیکی پۆلی ستایرینی کۆن و پاشماوە. بە هۆی تەکنۆلۆجیای تایبەتی دووبارە پیشەسازی، دەکرێنە شتی تازە بە تایبەتی پلاستیکی سووك و کوناوی کە بە ئینگلیزی پێی دەلێن (Foam).
زۆربەی پلاستیکە کۆنەکان لە ناوچە ولایەتی ماسوشیستس[٤٠] Massachusetts کۆ دەکـرێتـەوە بە تایبـەتی لە زانکـۆکـانی ولایەتەکەو قوتابخانەکانی. کارگەی کومپانیاکە دەتوانێت سالی (٣) ملیۆن کیلۆ لە پلاستیکی کۆنی پۆلی ستایرین پیشەسازی بکات.

**٣ ـ کومپانیای داو** (Dow).

ئەم کومپانیایە مەزنەی ئەمەریکا لەگەل کومپانیای دۆمتاری Domtar لە کەنەدا رێك کەوتنێکی نوێیان مۆر کردوە بۆ دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی (PET) و (HDPE). بە گوێرەی ئەم رێك کەوتنە لە سالی ١٩٩٠ وە دەست پێ دەکەن.

**٤ ـ کومپانیای پرۆکتەر ـ گامبل** Procter and Gamble.

ئەم کومپـانیـایـە یەکێکـە لە کومپـانیا مەزنەکانی ئەمەریکا. مەلبەندی سەرکیـیان لە شاری ستسناتییە[٤١] واتە لەولایەتی ئۆهـایۆدا کاردەکەن. کومپانیاکە بە دروست کردنی سابوونی تایـد ناوی دەرکردوە چونکە یەکەم کومپانیا بوون کە تایدیان

دروست کرد. لەم دووایی‌یەدا ئەمانیش دەستی‌یان کردەوە بە دووبارە پیشەسازی کردنی پلاستیکی کۆن.
سرووشتی‌یە پیشەسازی پلاستیکی کۆن و پاشماوە قازانجی زیادترە لەوە پیشەسازی یەیە لە ماددە سەرەکی یەکانەوە جێبەجێ بکرێت. مەسەلەی قازانج یەکەم مەرجە بۆ کارگەی پیشەسازی ئەگەر پیشەسازی‌یەك قازانجی نەبێت یان کەم بێت ئەوا قەپات دەکرێت.

پەراوێزوو سەر چاوەکان

١ - بۆ تێگەیشتنی پێکهاتووی کیمیایی پلاستیك تکایە سەیری ئەم سەر چاوەیە بکە.

دوکتور زنون محمد پیربادی - گۆڤاری کاروان - ژمارە

٢ - سوود لەم سەر چاوەی خوارەوە وەرگیراوە:

Ann M. Thayer Solid waste Concerns Spur Plastic Recyeling efforts Chem. and Eng. News, Jan 30/ 1989, Page 7.

٣ - سیلیلۆز = ماددەیەکی پۆلیمەری‌یە بە سروشتی لە لەشی دارو درەخت هەموو رووەکێك دا هەیە. لۆکە سیلیلۆزێکی پەتی‌یە.

٤ - پرۆتین = دیسانەوە ماددەیەکی پۆلیمەری‌یە Polymer و سروشتی‌یە لە ناو گۆشت و پێست و لەشی گیان لەبەر زۆرە.

٥ - توخم = عنصر

٦ - تەندروستی دەرووبەر = صحة البيئه.

٧ - دەرووبەر = البيئه ، المحيط

٨ - چەرخی پلاستیکی = العصر البلاستيكي Plasties ERA هەروەکوو چەرخی بەردین (العصر الحجري) یان چەرخی آسنین (العصر الحديدي) جۆن لە مێژوودا هەبوون. چەرخی بیستەمیش بریتیە لە چەرخی پلاستیکی.

٩ - پلاستیك = اللدائن - وەکوو pve و پۆلی ئەثیلین و پۆلی ستایرین.

١٠ - دبیۆن = ١٠٠٠ ملیۆن = ملیار

١١ - بە تایبەتی کیمیا زانەکان و تەندروستی زانەکان

١٢ - ئەم رێژەیە لە سەر بناغەی ماددەی رەق (صلب) ژمێراوە.

١٣ - قەبارە = حجم . قەبارەی پلاستیك گەورەیە.

١٤ - شتی فش = مواد فارغه مجوفه

١٥ - پرۆژە = مشروع

١٦ - فافۆن = المنيوم

١٧ - الكونكرس الامريكي = مجلس النواب والشيوخ.

١٨ - ماددە زانستی‌یەکان = المواد العلمية Seientic Naterials .

١٩ - ولاية = State ئەمەریکا دابەشکراوتە (٥٢) ولاية.

٢٠ - البلاستيك المطاوع للحراره او اللدائن الخاضعه للحراره.

٢١ - بەفرگر = ثلاجه.

٢٢ - جل شۆر = غسالة.

٢٣ - کیسەی نایلۆن = ناوەکە هەڵەیە چونکە نایلۆن ماددەیەکی جیایە وتایبەتی‌یە. (کیسەی پلاستیك) ناوێکی زانستی‌یانەیە نەك کیسەی نایلۆن. نایلۆن کوتاڵە و دەزووە یەکجار بەهێزە بۆ گۆرەوەی ژنان یان بۆ گوریسی تایبەتی و بەتانی گەرم بەکار دەهێنرێت.

٢٤ - لە کشت و کاڵی نوێ پارچەی پلاستیکی گەورە بۆ پەروەردەی رووەك بەکار دەهێنرێت بۆ پێکهێنانی (البيوت البلاستيكيه)

٢٥ - پلاستیکی کوندار. یان کوناوی - پیشەسازی‌یەکی پلاستیکی نوێیە. ماددە پلاستیکەکە زۆر سووکەو کونێ زۆری لە ناودا هەیە، پێی دەڵێن Foam واتە (وغف).

٢٦ - پێچین یان پێچان = التغليف

٢٧ - PP = پۆلی پرۆپیلین poly propy Lene .

٢٨ - ناوی ئەم تاقیگەیە بریتی‌یە لە:

Center For Plasties Recyeling Reseaneh (CPRR) .

٢٩ - PET = پۆلی (ئەثیلین تیرفثالات) واتە :

Poly ethylene Terph Thilate

٣٠ - لووزەو = تیار

٣١ - HDPE = پولی اثيلين عالي الكثافة High Density .

Poly elthlene .

٣٢ - الطريقة الكيمائية.

٣٣ - کارلێکی کیمیایی = التفاعل الكيمائي.

٣٤ - پۆلی یوریثان = Poly Urethane .

٣٥ - ئەم کۆمپانیایە بەشێکە لە کۆمپانیای Eastman Kodak لە نیویۆرك - ئەمەریکا.

٣٦ - تاسەی دەستکرد = مطبات صناعيه.

٣٧ - ئەم جۆرە کووتاڵە پێی دەڵێن (پۆلی ئیستەر Poly ester زۆربەی کووتاڵی لێ دروست دەکرێت.

٣٨ - کحوولی مەثیلی = الكحول المثيلي Methanol .

٣٩ - ئامۆژگای قوتوی پلاستیك Plastic Bottle In stitute of (SPI)

٤٠ - ماساشوستیس = یەکێکە لە وڵاتەکانی ئەمەریکا کە کەوتوتە خۆرهەڵاتی ئەمەریکا. کەوتوتە سەرووی ولایەتی نیو جەرسی و نیوو یۆرکەوە.

٤١ - سنسناتی Ciucinati شارێکی گەورەیە لە ولایەتی ئۆهایۆ OHIO لە ئەمەریکا.

●

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## هەولێر

م. پەریشان

● پێشانگا ●

دیسان لە هۆڵە خنجیلانە هونەریەکەی ئاریداو ، بەچاودێری بەرێز حسن حسین اللداد جێگری ئەمینداری گشتی رۆشنبیریو لاوان . پێشانگای سێیەمی هونەرمەند (قاسم صابر) کرایەوە. کەماوەی مانگێکی تەواوی خایاندو، جەماوەرێکی زۆریش پێشانگاکەی بینی.

ئەوەی کە جێگای سەرنجە کاک قاسم لە هەردوو پێشانگاکەی پێش ئێستایدا. بابەتەکانی زیاتر لەچوارچێوەی خودی خۆی دەرنەدەچوون و، رەشبینیەکی سەیر سەرجەمی تابلۆکانی داپۆشیبوو... کەچی لەم پێشانگایەدا بە پێچەوانەوە دەبینین کاک قاسم پێشکەوتنێکی دیاری بەخۆیەوە بینیوەو، جۆری تابلۆو، بابەتەکانی دابەش کراوە، بۆ چەند لایەنێک و توانیویشیەتی لە بەندیخانەکەی خودی خۆی رزگاری بێت .

**«کورتەیەک لە ژیانی هونەرمەند»**

**- لە ساڵی (١٩٥٩)دا، لە هەولێر، لە دایک بووە.**

**- یەکەم پێشانگای لە ساڵی ١٩٨١ لە هۆڵی ئەمیوبیەدا کردوتەوە.**

**- دوەم پێشانگای لە ساڵی ١٩٨٩ لە هۆڵی میدیا کردوتەوە.**

**- لەگەڵ بەشداری کردن لە کۆمەڵی پێشانگای کۆمەڵیو هاوبەش.**

● کۆڕێکی ئابووری ●

لە چالاکیەکانی دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی، کۆڕێکی ئابووری لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران بۆ کاک (یوسف قادر) رێکخرا . کە لە لایەن برای هونەرمەند کاک (محسن محمد)هوە کۆڕەکە بەڕێوە دەبرا . کە بەناوی سەرەتایەک دەربارەی گەشەسەندنی ئابووری بوو. باسەکەی کاک یوسف لەشەش بەشی سەرەکی پێکهاتبوو.

**١- روونکردنەوەی چەند زاراوەنێک .**

**٢- هۆکارەکانی دواکەوتوویی وولاتە تازە پێگەیشتووەکان .**

**٣- واتای دواکەوتوویی ئابووریو هۆکەی.**

**٤- تیورەکەی والت و ویلتمان رۆستو.**

**٥- تیورەکەی نۆسکار لانکە.**

**٦- کاریگەری وولاتە داگیرکەرەکان بۆ سەر وولاتە تازە پێگەیشتووەکان لە رووی ئابووریو کۆمەلایەتیو هۆشیاریەوە.**

**سەرباری ئەوەی کەباسەکەی کاک یوسف قادر پشتی بەمەنهەجێکی ئەکادیمی بەستابوو. لەگەڵ ئەوەشدا چەند نموونەیەکی گونجاوی هێنابۆوە.**

**کە باسەکەی زیاتر پتەوو بەهێز کردبوو.**

**ئەگەرچی کۆڕەکە، دوو کاژێری تەواوی خایاند کەچی توانی جەماوەرە ئامادەبووەکە بۆ لای خۆی رابکێشێ و سوودێکی باشیش بە خوێنکارە ئامادەبووەکانی بەشی ئابووری بگەیەنێ.**

**کە هەر لەلایەن ئەمانیشەوە لە کۆتایی باسەکەدا گفتوگۆیەکی باشیش کرا .**

● شانۆگەری - یادگارەکانی میم

لە چالاکیەکانی ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیریو لاوان و، لە نمایشی تیپی نواندنی هەولێر شانۆگەری، یادگارەکانی میم پێشکەش کرا. ئەم شانۆگەریە کە





لەسەر شانۆی (ئیبنی مستەوفی) نمایش کرا، لە نووسینی، سعدون العبیدیو، وەرگێرانی، ئازاد مولودو دەرهێنانی، لطیف نعمان بوو.

شانۆگەریەکە، زیاتر دەکەوتە خانەی، پانتۆمایمەوە. ئەگەرچی لەپاڵ (ئەنوەر شێخانی) کە ئەکتەری سەرەکی بوو، هونەرمەندانی تریش

بەشداریەکی، بێ دەنگیان لە نواندندا، هەبوو. بەتایبەتی، خوشکە (فریدة فتح الله)و کۆمەڵێکی تریش کە کەمتر دەرکەوتن .

وەکو (مؤید فقی، طه ئاغاجان ، سلام کۆیی) بەلام وەکو بیروکەی سەرەکی شانۆگەریەکەو، دەنگ و، نواندن ، هەر لەدەوری برای ئەکتەر، کاك ئەنوەردا کۆببوەوە.

ئەگەرچی کاك ئەنوەر، دەمێکە لە شانۆ، دابراوە، ئەو دابرانەشی جۆرێك بوو، لە وازهێنان . کەچی لەم شانۆگەریەدا، بەشێوەیەکی تر، هاتەپێشەوە، توانی سەرنجی ئێمەی بینەر، بۆ لای خۆی، رابکێشێ. ئەگەرچی لەوەش دڵنیام کە زیاتری لەبارە دەتوانێ لەبەر هەمی تردا، بەگورتر خۆی. بچەسپێنێ.

بۆ ئەو دابرانەش خۆی روونتر وەلامی دامەوەو گوتی:ـ

پاش حەوت ساڵ دابرانم لە شانۆو، گەرانەوەم بەشانۆگەری، (یادگارەکانی میم). هەست بە راستییەکی تەواو دەکەم لە گەڵ خۆمداو ئەو کارەشم زورخۆش دەوێ و وەکو نواندیش لەخۆم رازی بووم.

لە کۆتاییدا، برای دەرهێنەر کاك (لطیف نعمان) زۆری مەبەست بوو، کە ئەم وەلامە بێ پرسیارەی بۆ بلاوبکەینەوە، دەڵی:ـ

(بەئاواتەوەم کە خۆشەویستی، بکەوێتە نێوانی، برا هونەرمەندەکان وبەتایبەتی هونەرمەندانی شانۆ، لەهەولێر. با خۆشویستن و لێك بوردن بکەوێتە نێوانمانەوە، بۆ دروست کردنی شانۆیێکی پێشکەوتوو) ئێمەش هەمان ، ئاواتیان بۆ دەخوازین .





### ● کۆرێك دەربارەی شاری هەولێر

شارێکی کۆنی وەکو شاری هەولێر.کە بە کۆنترین شاری دنیا، لەقەڵەم دەدرێ. بەقەلا دێرین و زێرینەکەی، بەمنارەکەی چۆلی، بەئاوەکەی میری،

بەگردەکەی قاڵینجاغەو کۆنە هەوارەکانی، عوزێر پێغەمبەرو سوڵتان موزەففەرو، شێخی چۆلیو

... تاد . دەمێکە پێویستی، بەدەیەها لێکۆڵینەوەی، چۆنی‌یەتی پێشخستن هەبووە، هەیە.

هەر بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزەش ،

مەڵبەندی رۆشنبیریو کۆمەلایەتی، زانکۆی سەلاحەددین بازنە

لێکۆڵینەوەێکی زانستی فراوانی، لەژێردروشمی (هەولێری ئەوساو ئێستاو ئاسۆی پاشەرۆژ) داپێشکەش کرد. کە دوو رۆژی، بە چوار کۆری تێرو تەسەل خایاند. کەبە چاودێری بەرێز یحیێ جاف پارێزگاری هەولێر بوو.

**کۆرەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەستیان پێ کرد**

**● وتەی سەرەتا بەرێز پارێزگاری هەولێر مامۆستا یحیێ جاف** پێشکەشی کرد.

**● وتەی زانکۆی سەلاحەددین ، لەلایەن بەرێز سەرۆکی زانکۆ مامۆستا خەسرەو شاڵی پێشکەش کرا.**

**●وتەی لیژنەی ئامادەکردن ، لەلایەن دکتۆر حیسام نەقشبەندی‌یەوە خوێنرایەوە.**

**ـ کۆرەکان ـ**

١ـ لەیەکەم کۆری سەر لەبەیانیدا، کە بەسەرەکایەتی بەرێز طلعت هادیو بریاردەری کۆریش دکتۆر محسن اسماعیل محمد بوو. پێنج لێکۆڵینەوە. پێشکەش کرا، کەتەرخان بوون ،بۆ تەوەری جوگرافی هەولێر. لێکۆڵەرەوەکان بریتی بوون لە بەرێزان (دکتۆر خلیل اسماعیل ، خاتوو نامیدە تاڵەبانی، لێکۆڵینەوەیەکی دوو قولی لە لایەن ـ اسماعیل علی شوکورو ... اسماعیل عەزیز ـ، فؤاد قادر أحمد، لێکۆڵینەوەیەکی تری دوو قۆڵیشی لە لایەن،ـ عبدالباقي عبدالجبار حەیدەریو... طاهر حەسۆ زیباری‌یەوە پێشکەش.کران .

٢ـ ئێوارە کۆری هەمان رۆژ کە تەرخان کرابووە، بۆ تەوەری مێژوویی، بە سەرۆکایەتی دکتۆر عبدالکریم عبدالسادەو، بریاردەری کۆریش ، دکتۆر عبد ربە سکران بوو. چوار لێکۆڵینەوەی‌تر، لە لایەن ئەم لێکۆڵەرەوانەوە پێشکەش کران. (دکتۆر ناهض عبدالرزاق ، دکتۆر

عبدالجبار قادر، دکتۆر عبدالله حداد، دکتۆر عماد الجواهري).

٣ ـ لە کۆڕی ڕۆژی دووەمدا، کەبەیانیەکەی بۆ تەوەری ژینگە تەرخان کرابوو، بە سەرۆکایەتی بەڕێز، دکتۆر نیاز جمیل میر ان و، بڕیاردەری کۆڕیش دکتۆر سمیرە عبدالحسین بوو. سێ لێکۆڵینەوەی تر پێشکەش کران . کە لێکۆڵەرەوەکان برایان (جمال زەنگەنەو، عبد علي خفاف و، ئەندازیار گوهدار فتحي معصوم) بوون .

٤ ـ دوا دانیشتن، کە لە ئێوارەی دووەم ڕۆژدا بوو تەرخان کرابوو بۆ ئامۆژگاری‌و بڕیار، کۆمەڵێ پێشنیاری زانستیانەو بڕیاری مەزن پێشکەش کران، کە بەراستی، ئەگەر بێنەدی، ئەوا هەولێر، بەدڵنیاییەوە دەبێتە جوانترین شاری کوردستان و وەکوو کەلەپووریش، هەموو شوێنەوارەکانی پێشدەخرێن و بەرچاوتر دەبن.

شایەنی باسە سەرتاپای کۆڕەکان بەتێبینی‌و ڕاو سەرنج و بۆچوونی ئامادەبووان دەوڵەمەند دەکران، کەبریتی بوون، لە مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەددین و میوانە بەڕێزەکانی زانکۆکانی تری وڵات و کۆمەڵێکی زۆر لەڕۆشنبیران و ئەدیبانی شاری هەولێرو قوتابیانی کۆلێجەکان.

**لەکۆتاییدا دەڵێم ئەم جۆرە بازنە لێکۆڵینەوە زانستیانە، کەڵێ بێویستن و مێژوویێکیش بۆ خۆیان تۆمار دەکەن.**

●

# سلێمانی

نووسینی: شوان

**«داخێکی گران و کۆچێکی لەناکاو»**

داخ... داخێکی سەخت و گران، ماوەیەکی کورتە چنگی بێ بەزەیی مەرگ هەڵەتی کت و پڕ بۆ گیانی ئەدیب و ڕۆشنبیرو مرۆڤە مەزنەکانمان ئەبات، ئەم جارە دەستی قەدەر گەیشتە گەرووی شاعیری لێهاتوو و داهێنەر «محەمەد ساڵح دیلان»و لە ڕۆژی ٢٨/١٠/١٩٩٠ لە ساتەمەرگێکی پەست و پڕ لە ئەندێشەو ژان و سوێدا ئەستێرەی بەختی ورد ورد کز بوو تا دواجار بەیەجگاری چرای ژیانی کوژایەوە.. هەر لەو دەم و سات و ڕۆژەشدا جەستەی دیلان بە خاکی پاکی گردی سەیوان سپێردراو بۆ هەمیشە دار ئەرخەوانەکان چەتری نازیان بەسەردا هەڵداویوو بە میوانی بێکەس و شێخ نووری شێخ ساڵح و گۆران و کامەران موکری‌و کاکەی فەللاح..

**- دیلان کێیە ؟! -**

دیلان بەتەنیا شاعیرێکی داهێنەرو لوتکەی ئەدەبی سەردەمان نەبوو.. بەڵکو دیلان مرۆڤێکی مەزن و هونەرمەندێکی بلیمەتیش بوو، شارەزای ئاوازە کوردیەکان بوو.. دیلان دواجار بەبەخششی داهێنەرانەی شیعری، شیعری نوێی کوردیی بەرەو لوتکەی داهێنان و ئەدەبی جیهانی سەردەم برد.



**«چلەی ماتەمی»**

ڕۆڵانی شار لەبوارە ڕەنگاڵەییەکانی ژیاندا هەموو سات و دەمێك داهێنانی سەرسوڕهێنەر ئەهێننە ئاراوە.

ئەگەرچی کۆچی ماڵئاوایی ئەدیب و ڕۆشنبیرو مرۆڤە دڵسۆزە مەزنەکان جێی داخ و دڵگرانیەکی سەختە، کەچی لەگەڵ ئەو کۆستەی لە ئەدەب و ژیانی ئەدەبیمان ئەکەوێت، هەڵێکی بەکەڵك بە مەبەستێکی دڵسۆزانە لەو بۆنەو ساتە پڕ لە پەژارەو ماتەمیە وەرگیراوە بۆ خزمەتێکی بێپایانی بواری ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی ئەنجام ئەدرێت!!.

**«ڕێز لێنان»**

ڕۆژی پێنج شەممە ١٣/١٢/١٩٩٠ لە هۆڵی ڕۆشنبیری‌و لاوان لەشاری سلێمانی؛ دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی بەهاوکاری لەگەڵ یەکێتی نووسەرانی کوردو دۆست و یارانی «دیلان»ی شاعیر کۆڕیادێکی یەجگار

مەزن بۆ چلەی ماتەمی دیلان سازکرا، میوانێکی زۆر لە ئەدیب و رۆشنبیرو هونەرمەندانی شاری هەولێرو دهۆك و کەرکوك بەغا ئامادە بوون.. هۆڵەکە جمەی ئەهات وسەرەرای ئەوەش ئەدەب و هونەر دۆستێکی زۆریش لە دەرەوەی هۆڵەکە گوێ گربوون.. کۆریـادەکـە وەك دەرفەتێکی پیرۆز بۆ برایەتی‌و دۆستایەتی‌و خۆشەویستی نێوان ئەدیبان رەخسێنرا.

«ئێوە و کور یادی دیلان»

سەرەرای ئەوەی لەو کۆریـادە مەزنـەدا گەلێ چالاکی ئەدەبی‌و هونەری پێشکەش کرا، بەو دەنگە بەسۆزەی «دیلان» خۆی لە چۆنیەتی لەدایك بوونی قەسیدەی ـ ئازار شکێن ـ دواو دوو ئاوازی ئاوازەش لە گەرووی زوڵاڵی دیلانەوە بیستراو جۆش و خرۆشێکی سەرسورهێنەری لە هۆڵەکەدا بەرپا کرد.

بەرنـامـەی کۆریادەکە لەلایەن هەڵسورینەری کۆرەوە «عەبدوڵڵا ئاگرین»ەوە پێشکەش کرا کە ئەم مامۆستا بەرێزانە بەم شێوەیە هاوشیان تیا کرد:ـ

١ ـ خوێندنی چەند ئایەتی لە قورئانی پیرۆز لە لایەن مامۆستا مەلا تایەرەوە.

٢ ـ مامـۆستـا مستـەفا نەریمان وتاری دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی پێشکەش کرد.

٣ ـ دکتـۆر نافـع ئاکرەیی‌و تاری یەکێتی نووسەرو ئەدیبانی کوردی مەڵبەندی گشتی لەناوچەی ئۆتۆنومی کوردستان خوێندەوە.

٤ ـ مامۆستا کامیل ژیر ـ بۆ چلەی ماتەمی دیلان ـ شیعر.

٥ ـ مامۆستا ساڵح کەریم ـ بۆ سروودێکی کوردی نەمر ـ وتار. هەر دوا بەدوای ئەو وتـارە مامـۆستـا مستـەفا ساڵح کەریم وتارێکیشی بەزمانی عەرەبی پێشکەش کرد.

٦ ـ مامۆستا فریا جاف ـ لاواندنەوەیەك بۆ دیلان ـ شیعر.

٧ ـ مامۆستا رەوف عوسمان ـ چەند دڵۆپێك فرمێسك بۆ دیلانی شاعیرو مرۆڤ ـ وتار.



٨ ـ مامۆستا مەحموود حاجی رەحیم ـ دیلانی نووستوو ـ شیعر.

٩ ـ دکتۆر عزالدین مستەفا رەسوڵ ـ شێنێ بۆ دیلان ـ شعرو پەخشانە شیعر.

١٠ ـ مامۆستا کوردۆ کاروان ـ چرپەی باران ـ شیعر.

١١ ـ مامۆستا خوسرەو جاف ـ گڵکۆو کۆستی دیلان ـ پەخشانە شیعر.

١٢ ـ وتاری بنەماڵەش لە لایەن کوری شاعیر ـ هونەر محەمەد ساڵح دیلان ـ ەوە خوێندرایەوە.

جگە لەو چالاکی‌یە ئەدەبی‌و هونەریانەی پێشکەش کران گەلێ شیعـری جوان و ناسك و وتاری بەپێز بە یادی دیلانی شاعیری مەزنەوە بۆ کۆرەکە هاتبوو.. داخ لەبەر کەمی دەرفەت نەلوا خاوەنـەکـانیان بە شیعروو وتار هاوبەشی تیا بکەن لەو شاعیرو ئەدیبە بەرێزو دڵسۆزانە:

١ ـ مامۆستا حەمە سەعید حەمە کەریم ـ وتار.
٢ ـ مامۆستا لەتیف قەرەداغی ـ شیعر.
٣ ـ مامۆستا حەمە صدیق مەحموود ـ شیعر.
٤ ـ مامۆستا محەمەد ئەمین پێنجوێنی ـ شیعر.
٥ ـ خوشکە صبری‌یە خەفاف ـ دایکی سوڵاف ـ شیعر.
٦ ـ مامۆستا ع . ح . ب ـ شیعر.
٧ ـ مامۆستا محەمەد پەشێو ـ شیعر.

٨ ـ خوشکه پەیمان عومەری هەنەرمەند ـ وتار.
٩ ـ خوشکه لەیلان ـ شیعر.
١٠ ـ خوشکه خورشیدە بابان ـ شیعر.
١١ ـ مامۆستا ئیسماعیل گەیلانی ـ شیعر.
١٢ ـ مامۆستا ئەحمەد حسین ئەحمەد ـ شیعر.
١٣ ـ مامۆستازوهدی ـ شیعر.
١٤ ـ مامۆستا غەریب زێوەر ـ شیعر.
١٥ ـ مامۆستا ئیسماعیل خورمالی ـ شیعر.
١٦ ـ مامۆستا حەمە ئەمین شێخ یەحیا نۆرەبابی ـ شیعر.
١٧ ـ مامۆستا جەمال پشدەری ـ شیعر.
١٨ ـ مامۆستا هاوری محەمەد حەمە سەعید ـ شیعر.
١٩ ـ مامۆستا نەجات نووری ـ شیعر.
٢٠ ـ مامۆستا عەبدوڵلا سالح شارباژێری ـ شیعر.
٢١ ـ مامۆستا هەڤال ئەبوبەکر هەڵەبجەیی ـ شیعر.
٢٢ ـ مامۆستا ماجد نووری قادر ـ شیعر.

**ـ تابلۆ و وێنە دەستخەتی دیلان ـ**

خوشەویستی «دیلان»ی شاعیرو.هونەرمەندو ئازایخوازی بورکانی بەهرەی گەلێ هونەرمەندی لاوی تەقاندەوە. هونەرمەندی لاو: کاروان قادر کابان و مستەفا مەحموود لەماوەیەکی کەمدا هەریەکەیان بەدەست و خامەی هونەروەری‌و رەنگینیان وێنەیەکی گەورەی دیلانیان بە بۆنەی چلەی ماتەمینەکەوە بەجوانترین شێوە پێشکەش کرد.

**ـ هۆڵی دیلان ـ**

شایانی باس و رێزلێنانە ـ شەوێ دوا کۆتایی کۆڕیادەکە.. ئەدیب و رۆشنبیرانی شارو میوانە بەرێزەکان لە کۆڕێکی خنجیلانەی «یاران»داو بەپێشنیازی مامۆستا مەحمود زامدار، دکتۆر نافع ئاکرەیی بەناوی یەکێتی نووسەرو ئەدیبانی کوردەوە ئەو بریارەی راگەیان بە مەبەستی رێزلێنان لە شاعیری مەزنی کورد «دیلان» هۆڵە گەورەکەی بارەگای یەکێتی نووسەرانی کورد لە سلیمانی بە ناوی «دیلان»ی شاعیرەوە بێ...

★ ★ ★

**«مەڵبەندی سەرپەرشتی‌ی زانستی‌و چەند چالاکیەکی رۆشنبیری»**

جێی ئاماژە بۆکردنەکە مەڵبەندی سەرپەرشتیی زانستی لەسلێمانی بەردەوام لە سازدانی کۆڕی رشنبیری‌و زانستیدایەو جگەلەوەی ناوبەناو بلاوکراوەی زانستی بلاودەکەنەوە.

لەو چالاکیانەی کە لەم دووایییەدا پێشکەشیان کرد:

١ـ بەشی کومپیوتەر هەڵسا بە لەچاپدانی چەند بلاوکراوەیەکی تایبەت بەزانستی «کومپیوتەر».

٢ـ لە رۆژی ١٠/٦/١٩٩٠دا پیشانگایەکی زانستیان لە رانیە کردەوە.

٣ـ لە رۆژی ١٦/٦/١٩٩٠دا مەڵبەندی ناوبراو خولی هاوینەی خۆیکردەوەو پێشوازی لەگەڵی قوتابی کرا.

٤ـ مەڵبەندی ناوبراو لەرۆژانی ١٩ تا ٢٢/٦/١٩٩٠ بەگەشتێکی زانستی هەڵسا بۆ کۆمپانیای ئەلکترۆنیی نیشتمانی‌و شایانی باسە ئەم گەشتە تایبەت بوو بە ئارەزوومەندانی فەلەك ـ فیزیا ـ کارەبا ـ ئەلیکترۆن.

٥ـ گەشتێکی زانستی‌ی تر بۆ بەشەکانی فیزیاو کیمیاو ئەلیکترۆن و کارەبا بۆ کارگەی جگەرەی سلێمانی لە ٢٤ـ٦ـ١٩٩٠دا.

٦ـ لەچاپدانی بلاوکراوەیەکی فیزیایی بە ناونیشانی «الجدید في الفیزیاء» بەسەرپەرشتی‌ی مامۆستای پسپۆر لە فیزیادا «سەیران محمد رؤوف». ئەم بلاوکراوەیە لە دوو توێی خۆیدا نوێترین زانیاری‌یە فیزیاییەکانی هەڵگرتووەو ئەم کارەش هەنگاوێکی نوێ‌یە کە مەڵبەندی سەرپەرشتی زانستی لەسلێمانی پێی هەڵدەستێت لەپێناوی بلاوکردنەوەی هۆشیاریی زانستی داو شایانی باسە ئەم بلاوکراوەیە بەسەر چەند قوتابخانەیەك و دەزگا زانستیەکاندا بلاوکرایەوە، ئەو قوتابیانەی لەوەدی هێنانی ئەم بلاوکراوەیەشدا بەنووسین و بەرهەمیان بەشداریان کردبوو: (عبد القادر توفیق، محمد مجید عارف، غالب رحمن، سامان صلاح الدین، نیگار فائق عمر، نعمان عبدالله، سالار علی أحمد، دلشاد مصطفی).

ئەمەو جگە لەوەی هەر لەلایەن هەمان مەڵبەندەوە چەندان کۆڕی زانستی‌ی دی سازدران.




## هونەری کوردی لە مەڵبەندی صدام دا

لەم دواییەدا لە دالانەکانی مەڵبەندی صدام دا، لەژێر ناونیشانی چەند نموونەیەك لە هونەری عیراق هاوچەرخ پیشانگایەکی گەورە کرایەوە.

**هونەرمەندان دارا حمەسەعی، دارا محمد علي، نامق علي قادر، برهان صالح، شوان کمال وهەڵگورد عبد الوهاب هەر یەکەو بەچەند تابلۆو بەرهەمی هونەری بەشدارییان تیادا کرد.**

شایانی باسە هونەرمەند دارا حەمە سەعی بەسێ بەرهەمی (ریلیف) زۆر نایاب بەشداری کرد، ناوی بەرهەمەکان (عیراقی مەزن)ن.

بە پەنجە زێرینەکانی بایەخێکی زۆری بە شارستانیەتی ئاشورییەکان داوە، دەسەلات وهێزی مرۆڤ و پاڵەوانیەتی ئەو سەردەمەو بەهێماکانیانەوە (تیروکەوان، شێر، ئەسپ و عارەبانە) بەجوانی بەرجەستەکراوون، هەستت بەدرامای جەنگ و بەرهەڵستی مرۆڤ دژی شەڕ و خراپە کاری دەکرد. هونەرمەندان و جەماوەر بەدڵخۆشی و سەرسورمانەوە سەیری ئەم بەرهەمە کوردییە گەورەیان دەکرد.

● **هونەرمەند (دارا محمد علي) بەدوو تابلۆی گەورەدو قەشەنگ بەشداری کرد، یەکەمیان بەناوی (سەرەتا)و دووەمیشیان بەناوی لەگەڵ قودس دا).**

لە تابلۆی سەرەتادا خۆشەویستی نێوان دوو مرۆڤ (نێرو مێ)ی بەرجەستەکردووە هەروەهاش دوو چۆلەکە و هێلانەیەك بەشداری لەو هەستە جوانە دەکەن ئەگەرچی لەیەکدی دوور کەوتبوونەوە، سروشتیش رۆڵێکی گرنگ دەبینێ بەتایبەتی هەتاو شاخ ودرەخت کە بەم جۆرە رەنگانە (شین، زەرد، پرتەقالی پەمەیی، سەوز) جوانی وهەستی ناسکی هونەرمەند بەرجەستە دەکەن.

**تابلۆی دووەمی** بەناوی (لەگەڵ قودس دا) بریتی بوو لە رۆشنایی خستنە سەر دوو چاوی تیژو وریای مرۆڤێکی شۆرشگێر کە دەروانێتە ئاسۆی جیهانێکی پڕ لە کۆشش و خەبات لەگەڵ هێلی هەشت دەم و چاوکە لە پێناوی وڵاتەکەیاندا قوربانییان داوەو راستە مردوون بەڵام لەناخی ئەو مرۆڤە تورەیەدا هێشتا هەر زیندوون.









ئاسمانێكی زەردو مەیلەو پرتەقاڵی باوەش بۆ هەتاوێكی سەوزو زەرد كردۆتـەوەو تێكـەڵی دمیـەها شەپۆلی شین و زەرد بوون، بەرادمیـەك هەست دمكـەیت.شەپـۆلەكـان بوونـەتە چیا یان بەپێچەوانەوەو بەرهەڵستی ئەم چەرخە پڕ جەنجاڵ ئاژاومیە دمكەن.



هونـەرمـەنـد نامـیـق علي قادریش بەدوو تابـلۆی جوان وسـەرسـورهێنەر لەم پیشانگایەدا بەشداری كرد، تابلۆكانی بەناوی (هەڵەشەیی هێڵ ورمنگ) بوون.

بە هێڵە بەیەكا .چوو و رمنگاو رمنگەكانی بەرجەستەی ئاڵۆزی بیرو فەلسەفەی مرۆڤی سەردممیان دمكرد. هونەرمەند هێمای جیهانێكی تایبەتی بەبینەرانی دمبەخشی.

● **هەروەها هونەرمەندان بورهان سالح وشوان كەمال و هەڵكورد عبدالوهاب، هەریەكەو بەبابەت و بەتەكنیكێكی تایبەتیەوە جوانیيان بەخشیبووە ئەو پیشانگایە.**

شایـانی باسـە هونـەری كوردی سەرنجی جەماوەری هونەر دۆستی ئەم پێشـانگـایـەی راكێشـا بە شێوەیەك كە جێگای رەزامەندی هەموو پسپۆر و هونەر دۆستان بوون.

## ئەندێشەی مرۆڤێك

لەم رۆژانەدا چیرۆك نووسی بەناوبانگ و لێهاتووی كورد كاك حسـین عارف بە ئەو پەری خۆشـەویستیـەوە چاپی یەكەمی رۆمـانـە تازەكـەی (ئەندێشەی مرۆڤێك)پێشكەش بە ئەدەب وخوێنەرو كتێبخانەی كوردی كرد.

ئەم رۆمـانـە لەدوو بەش پێـك هاتووەو لەمەوبەر لەرۆژنامەی هاوكاریدا هەرجارەی ئەڵقەیەكی لێ بلاودەكردەوەو خوێنەر بە پەرۆشییەكی ئەوتۆ چاوەڕێی ئەڵقەكانی تری دەكردو ئێستاش نووسـەر خۆی تەنیـا ووتـەیـەكی بەنـاوی خۆی لەرەسەتای




بەرگەكەدا بۆ نووسیوەو بە كورتی باسی ئەم ئەزموونە تایبەتیەی خۆی دەكات.

جیـاوازییـەكی زۆریش لەرووی بابـەت و تەكنیكـەوە لەنێوان رۆمانی یەكەمی كاك حسـین (شار)و ئەم رۆمانەدا هەیە. ئەگەر بەووردی سەرنج بدەین و لەسەرەخۆ تێكەڵی ژیانی ئەو شەش رۆژەی پاڵەوانە سەرەكیەكەی ئەم رۆمانە (سەبری) ببین هەست دەكـەین ئەنـدێشـەی ئەم پاڵەوانـە ئەنـدێشەیەكی تایبەتیو گشتیيە و نووسەر سەركەوتوانە توانیوە بەرجەستەی لایەنێكی زۆری بیرو بۆچوون و وەهەروەها تێڕوانین و فەلسەفەی ژیانی ئەم پاڵەوانە بكات.

شایـانی باسـە ئەم رۆمـانـە ئازیـزە بەقـەوارەیەكی تایبەتی لەچـاپخـانەی (الاجیال)دا لەچاپ دراوە، نرخیشی گران نیەو لەدوو سەدو شەست و یەك لاپەرە پێك هاتووە. هونەرمەندان كاك ئازا حسیب قەرەداغی وێنەی بەرگی كێشاوە وكاك قادر علي مردان سەرپەشتكاری چاپی كردووە. پیرۆز بایی لە خۆمان و كاك حسین وخوێنەر دەكەین.

## ئێزگەی کوردیو خولی نوێ









لەم رۆژانــەدا بڕیــاردرا بۆ دانــانــی خولی نو ێــی بەرنامەکانی ئێزگەی کوردی لەبەغدا.

دوای چەنـدین کۆبـوونـەوە لەلایـەن کاربەدەستانی ئێزگەی کوردی گەیشتنە دانانی کۆمەڵێ بەرنامەی نوێ کە دەبێتە مایەی بەستنەوەی گوێگرانی رادیۆی کوردی.

شایـانی باسـە ئەم خولەیـە جیاوازییەکی گەلێ زۆری لەگەڵ خولەکـانی پێشـوودا هەیـە لەلایـەن دابەشکردنی چۆنیەتی بەرنامەکان لەکاتی پەخش کردنیاندا.

بەرنـامـەکـانی ئەم خولەیـەش بریتـین لە بەرنامەکانی بەشی هەمەرەنگ کە لەچەند بابەتێکی رەنگاورەنگی دڵخۆشکەر پێکهاتووە.

هەروەهـا سەبـارەت بەبـەشی رۆشنبیری کەلە گەلێك بابەت و مادەی ئەدەبی بەنرخ پێکهاتووە کەلەلایەن کۆمەڵێکی زۆر لە ئەدیبان و نووسەرانی کوردەوە ئامادە دەکرێن،

دەربارەی بەرنامەی رامیاریو پەرەپێدان کە ئەویش لەگەڵێك بەرنـامـەی سیاسی پێك هاتووە کە پشت بە تازە ترین هەواڵ دەبـەستێت و هەروەهـا گەلێـك چاوپێکـەوتن سەبـارەت بە پەرەپێدانی لایەنی کشت و کاڵوڕێنماییەکشت و کاڵییەکان ئاراستەی جوتیاران و کرێکارانی کوردستان دەکرێ.

بەشی تەمسیـلی خەریکی دانانی پلانێکی ئەو تۆن کە بتوانن هەمـوو تیپـە نوانـدنـەکانی کورد تێیدا بەشداری بکەن و. چەندین بابەتی نوێو رێبازی دونەڕی پێشکەش بەجەماوەر بکەن.

لەم خولەیـەش دا بەرنـامەیەکی رۆژانە هەیە کە بەناوی (بە یانیت باش)و بۆ ماوەی سەعاتێك وچل و پێنج دەقیقە دەخایەنێت.

ئامـۆژگاریو رێنمایی کردن بۆ شۆفێرو قوتابیان و لەگەڵ چاو پێکەوتنی تەندروستی لەگەڵ پزیشکەکاندا پەخش دەکرێت.

بەرنـامـەیـەکی تر بەنـاوی (ئێـوارەت باش) کە دووبـارە بەرنـامـەیەکی رۆژانەیەو بریتی‌یە لە پەخشان و هەڵبەست و ئاوازی نوێ.

بەنیسبـەت بەرنامە سەرکەوتوو و بەناو بانگەکەی کاك جمال بروارى (دگـەل گوهـدارا) بڕیـار دراوە بەردەوام بێتـەوەو بەشێوەیەکی نوێترو لەهەفتەیەك دا دووجار بڵاو بکرێتەوە.

سەبارەت بەکاری ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی کوردستان رۆژ بەرۆژ بەهۆی پەیامنێرەکانیانەوە لەو ناوچانەدا کار پەرەدەسێنێ.

پیرۆزبـایی لەم خولە نوێیـە دەکـەین و هیـوادارین کادیرو کارمەندانی ئێزگەی کوردی لەخزمەتی گوێگرانی کورددا هەر لە سەرکەوتن و پێشکەوتن دا بن.

## هونەرمەند ئومێدو چەند تابلۆیەکی تایبەتی



لەم رۆژانــەدا هونــەرمەند (ئومێد عباس أمين)و چەند هونــەرمــەنــدێکی تر لە هۆڵی (تحرير) لە بەغدا پێشانگایەکی هاوبەشیان کردوە.

هونــەرمــەند ئومێد یەکێکە لەو هونەرمەندە لاوو خوێن گەرمــانەی کە هەمیشە لە گەران و دۆزینەوەی بابەتی نوێو بەنــرخــدا بەردەوامــە سەرەرای خۆشەویستی بەرانبەر نیگار کێشــانی شوێنــەوارو کەلەپــوورو ژیانی کۆمەلایەتی‌ی شارە دێــرینــەکــان. زیــرەکی‌ی لە بەکارهێنانی شێوازێکی تایبەت بەخــۆی بەووردی لە تابــلۆکــانــی‌دا دیــارەو بەلایــەوە لاسایی‌کردنەوەی هونەرمەندانی پێش خۆی هەڵویستێکە لەگەڵ راو بۆچوون و تێروانینی هونەرمەندی ووردبین و هاوچەرخ دا ناگونجێت، بەتایبەتی ئەو هونەرمەندە راستەقینەیە کە ژیانی گشتی‌و تایبەتی‌ی خۆی بۆ دوارۆژێکی پر لە بەخشش تەرخان دەکات.

ئەو تابلۆ رەش سپییــانە کە پیشان درابوون و لەلایەن زۆربەی جەماوەرەوە بەسەند کران بریتی بوون لە نیگارکێشان و بەرجــەستە کردنی چەند هۆنراوەیەکی شاعیران (بدر شاكر السياب و طه المراياتي).

ئەم ئەزمــوونــە نوێیەیشی کە یەکەم جارە هونەرمەند بە خەون و عیشقێکی پیرۆزەوە تێکــەڵی بووەو پێشکەشی دەکات، ئەزمــوونێکی زۆر گرانەو تواناو تەکنیکێکی تایبەتی پێویستە، بۆیە بە شێوەیەکی راستەوخۆ هەستمان بە درامای مردن و لە دایك بوون، خۆشەویستی‌و رق ، دڵنیایی، نیگەرانی‌و خەم و خۆشی، بەیەکداچوونی دوو هێزی گەورەی ناخ (چاکەو خراپە، بیری فەلسەفی‌و هەروەها هیواو بێ‌ئومێدی.. رادەکێشێت.

لەم تابلۆیــانەدا زاڵ بوونی هونەرمەند بەسەر ئەو (قلم جاف)ەی کە بۆ بەرجەستەکردنی تێرامان و نهێنییەکانی مرۆڤی سەردەم بەکاری هێنابوو دیار بوو، وەك خۆی دەڵێت:

ـ بەکارهێنانی قەلەمی جاف بۆ ئەم جۆرە هونەرەکارێکی قورســە چونــکــە ئەو هەلانــەی کە دروســت دەبــن بواری راستکردنەوەیان نییە.

بەلای منەوە فڵچە بە شێوەیەکی ئاسایی رەنگ دروست دەکات، بەلام رەنگی رەش و سپی گەورەیی‌و هێــزی بیری هونەرمەند بەشێــوەیــەك دەخــاتە روو کە رەنگەکانی تر لە خۆیانەوە بە ئاشکرایی‌و ئاسایی هەموو شتێك دەردەخەن.

ئەوی راستی بێت غەمێکی هەمیشــەیی سەرتاپاگیری تابلۆکــانی ئومێــدیان داپۆشیبوو، هونەرمەند دووپاتی ئەوەی کردەوەو گوتی:

ـ ئەگــەر غەم نەبێت هونــەرمەند لە دایك نابێت غەمی ئاسایی‌و غەمی رۆژانە لە غەمی قووڵ و گەورە دەبێت جیابکرێتەوە.

شایــانی باســە هونەرمەند ئومێد لە ساڵی ١٩٦٣دا لە شاری خانــەقین لە دایك بووەو لە ساڵی ١٩٨٦دا ئامۆژگانی هونــەرە جوانــەکانی بەغدای تەواوکردووەو حەوت پێشانگای تایبــەتی‌ی کردووەتــەوەو چەنــد جارێکیش خەلات کراوە. لە تابلۆکــانی‌دا دیــارە پاشــەرۆژێکی رووناکی دەبێت و هیوای سەرکەوتن و بەرەوپێشەوە چوون و پەرەسەندی بۆ دەخوازین.



